# پەروەردە لە ئیسلامدا

چمکێکە لە یاسای پەروەردەی ئیسلام بە شێوەی

شانۆیی . ئامادەکردن و پێشکەش کردنی

ئەحمەد کاکە مەحموود

مطبعة اسعد - بغداد

بسم الله الرحمن الرحيم

- يا أيها الذين آمنوا ان من أزواجكم وأولادكم عدوا لكم فاحذروهم ٠
- يا أيها الذين آمنوا قوا أنفسكم وأهليكم ناراً وقودها الناس والحجارة عليها ملائكة غلاظ شداد لا يعصون الله ما أمرهم ويفعلون ما يؤمرون ٠

صدق الله العظيم

- كلكم راع ٠٠ وكلكم مسئول عن رعيته ٠٠ والرجل راع في أهله وهومسئول عن رعيته ٠٠

والمرأة راعية في بيت زوجها وهي مسئولة عن رعيتها ٠٠

# دیاری بێت

- بۆ گیانی پاکی ئەوانەی یارمـە تیان دام بۆ دۆزینەوەی رێگـەی راست ..
- بۆ ئەو گیانانەی چاویان بڕیوەتە ڕێگەی بەختیاریی .
- بۆ ئەو رۆشنبیرا نەی ماخۆلانیان پێکـەوتووە بۆ بە دەست هێنانی ئازادیی ..
- بۆ ئەو رۆشنبیرا نەی ماخۆلانیان پێکەوتووە بۆ بـە دەست هێنانی یەکسانیی ..
- بەو منالە شیرینە جگەرگۆشانەم کـە ئێستا سـەر بەدەرگای ژیاندا ئـەکـەن .
- بە هەموو باوك و دایکێکی کورد کە بیەوێ پەروەردەی رۆلەکانی بـەپێ بەرنامـەی ئیسـلام بکات .
- وە بە هەموو ڕۆڵەیەکی کورد کە بە شوێن راستیدا بگەڕێ ، وە لە هەرکوێ دەستی کەوت وەری بگرێ .

بەمانە هەموو ئەم کتێبەم دیاریی و پێشکەش بێت .

# پێشـــەکی

سوپاسی بێ پایەن بۆ خوای گەورە ، وە درووود و ستایش بۆ ســەر دەروونی پاکی پێغەمبەر • ئینجـا لەوەوە سـەرواز کات بـۆ ســەر گیانی پاکی هاوەڵە نەجیم و بە ئەدەبەکانی •

لەبەر ئەوەی زوربەی رۆڵـە و لاوەکانمان سـەریان لێ چەواشـە بووە و هــەر رۆژەی یەکێ یاریان پێ ئەکات •!! وە هــەر رۆژەی بـە شێوازێت گفتوگۆیان لەگەڵا ئەکەن •• ؛ وە هەر رۆژەی بە کالایەکەوە خۆیانیان پێ پیشان ئەدەن •• وە هەر رۆژەی لە ریگە و بۆ سەیەکدا بۆیان دائـەنیستن ••

پێویستی سەرشانی باوك و دایك و هەموو یەکەس و کارێکە هەریە لە لە ئاستی خۆیەوە هەول بدات بـۆ پێکەیاندن و ئاگادار کردنیان لەو جۆرە گورگانە دینە سەر ڕێگەیان ،بەشکوم وایان لێبێت هێز و پێزیت وەرگرن و لە ئەووژمی خوانەناسان خۆیان لابدەن •

چونکە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه و سلم ـ ئامانجی سەرەتایی ئـەوە بـوو ئەە کۆمــەڵە پیاوێك هــەڵبخات •• چەند دڵ و ویژدانێـك پالاوتـە بکات •• بناغەی کەلیك دابرێژێ • دەبـا ئێمەیش هەموومان شـارەزای شێوەی پەروەردە کردنی پێغەمبەر و هاوڕێکانی بین • ئایا هەمووی جیهان نەجیم تر و بەڕێزتر و بە سۆزتر و بە ئەدەب تری بینیوە لە وان •• ؟ •

ئەگەر وا نیە بۆچی قورئان لە وەصفیانا دێت و ئەفەرمێ :

**« محمد رسول الله والذين معه أشداء على الكفـار رحماء بينهم •• الفتح » ٢٩ « كانوا قليلا من الليل ما يهجعوو ، وبالأسحار هم يستغفرون ، وفي اموالهم حق للسائل والمحروم » الذاريات : ١٧**

**« والذيـن تبـّوؤا الدار والايمـان من قبلهـم يحبّون من هاجـر اليهم •• الحشر ٩**

یار و هاوەڵەکانی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه و سلم ـ ئا بەو جۆرە بوون لە ناو یەکترا ‥ ، بۆیە دەوڵەتێکی بەرفراوانی بێ سنووریان فەراهەم هێنا ‥ !

بەڵام دوژمنانی ئیسلام لەم دوا دوایەدا توانیان بگەنە ئامانجی پیسیان بۆ قەڵاچۆکردن و گۆڕانی ( کۆمەڵی ئیسلامیی ) وە گێڕانی بە چەند گەلێکی سەربڕاو ‥

وە کردنی بە چەند دەوڵەتێکی دوژمن بە یەك ‥ رێبازیان جیاواز ‥ ئامانجیان جیاواز ‥ فیکرە و بیر و رچەیان جیاواز ‥ مل ئەنێن بێ ئامانج ‥ ! ئەژین بێ ئەمەی هەوڵ بدەن بۆ یەکێتی و نەمریی ٠

تەنانەت هی وایان هەیە ، بەلایەوە وایە کە رێگەی ئیسلاح و چاککردن داخراوە ‥ ! وە ئەڵێت :
دیارە تازە ئاخر زەمانە هەر کەس ئازایە خۆی لابدات !! ئەم فیکرەیە هەڵەو ناڕەوایە چونکە :ـ

أ ـ موسڵمانەکان کاتێ تێگەیشتن کە ئیسلام ئاینی هێز و پێزە و دروشمیان ئایەتی :

« وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة ‥ » یە الأنفال : ٦٠

کەوتنە جم و جووڵ و شۆڕش و جیهاد ٠

ـ رۆژێ تێگەیشتن کە ئیسلام ئاینی زانیارییە ‥ و دروشمیان ئایەتی :

« وقل ربي زدني علماً ‥ » یە طـه ١١٤

ئیتر پەلاماری زانیاریاندا ٠

ـ رۆژێ تێگەیشتن کە ئیسلام ئادەمیزادی کردووە بە جێنشینی خوای گەورە ، لە زەویدا ، وە دروشمیان ئەم ئایەتەیە :

« واذ قال ربك للملائكة اني جاعل في الارض خليفة » البقرة : ٢٩

کاروباری زەویيان گرتە • ژێردەست بە ڕێك‌وپێكی •

ـ ڕۆژێ تێگەیشتن کە ئیسلام ئـەم بوونـەوەرەی رام ژێردەستە کردووە بۆ ئادەمیزاد تا لە خزمـەتی کرۆی ئادەمیزادا بەکاری بێنێ بـە پێی ئـەم ئایەتـە •

**« وسخر لكم ما في السماوات وما في الأرض جميعـاً منـه » الجاثية ١٢**

هەوڵیان دا بۆ دەرخستن و ئەم دیو و ئەو دیو کردنی نهێنیەکانی •

ـ ڕۆژێ تێگـەیشتن ئیسـلام ئاینی کـار و کردەوە و چالاکیی و ڕاپەڕینەو بەڵگەیـان ئایـەتی :

**« هو الذي جعل لكم الأرض ذلولا فامشوا في مناكبهـا و كلوا من رزقه واليه النشور •• » الملك ١٥**

پەلاماری کرد و کەسابەتیان دا •

ـ کاتێ تێگەیشتن کـە ئیسـلام ئاینی عیزەت و سەربـەرزیی و کەرامەتە ، وە ئەبێ ئەو تاجـە بکەنە سـەريان وە ئاڵاکەی بـە تـەواوی جیهانا ڕاکەیەنن و دروشمیان ئەم ئایەتەیە :

**« و لله العـزة و لرسـوله و للمؤمنين و لكـن المنافقين لايعلمـون » المنافقـون : ٨**

ئیتر سەرشۆڕیی و ژێردەستی‌يان وەرنەگرت •• !! •

وە بوونە مامۆستای ئازادي و سەربەستیی •

ب ـ ڕۆژێ تێگەیشتن کە فەلسـەفەی دروست‌بوونیان بەندایەتی کردنە بۆ خوا و گەردن کەچیە بۆ پرۆگرامی خوا ، وە هەڵگرتنی ئاڵای داد و عـەداڵـەتە • بـەردەوام‌بوونە لەسـەر رزگارکردنی بـەندەکان لە بـەندایەتیی ئادەمیزادەوە بۆ بەندایـەتیی پـەروەردگاری بوونـەوەر ••

ئیهەڵدانی هەر بیر و بروایێکە لە ئیسلامەوە هەڵ نەقولا بێت ..
ئینجا خوایش لێیان ئەپرسێتەوە .

کەوابوو بائێمەیش وەك ئەوان بکەین ، وەك ئەوان بڵێین ، رێگەی ئیسلاح بگرینەبەر ، هەموومان خومان بە بەر پرسیار دابنێین بەرامبەر بە یەکتر ... پشتی یەکتر بەر نەدەین تا ئاینەکەمان ئەبووژێنینەوە و گیان ئەکەینەوە بە بەریا .. دەستمایەیش بۆ ئەمە تەنها یەك شتە ..

« **پەروەردەیەکی ئیسلامییە** » پەروەردەی تاك ، خێزان ، کۆمەڵ ، منداڵ .

گرنگەکەیان پەروەردەی منالە .. !! چونکە ئەگەر منال لە رەووشتا تەواو بێت ، ئیتر خێزان تەواو ئەبێ و کۆمەڵیش تەواو ئەبێ .
کەوابوو منال بەردی بناغەیە بۆ ئەوان ، بۆیە ئیسلام ئەوەندە گرنگیی داوەتێ .

هەر لەبەر ئەمە بوو منیش بە پێویستم زانی لەم بارەیەوە شتێك پێشکەش بە گەلی موسڵمانی کورد بکەم .

هیوام وایە توانیبێتم هەڵسابم بە ئەرکی سەرشانی خۆم .. وە سوود بەخش بێت بۆ رۆڵەی گەلی کوردی موسڵمان .

« **رب اجعلني مقيم الصلاة .. و من ذريتي ربنا و تقبل دعاء** » **ابراهيم ٤**
« **... ربنا هب لنا من أزواجنا و ذرياتنا قرة أعين و اجعلنا للمتقين إماماً » الفرقان٧٤**

« **.. و اصلح لي في ذريتي .. إني تبت اليك ، و إني من المسلمين » الاحقاف ١٠**

٤ ی ربیع الاول ی ١٤٠٢ . ك

٢٩ ی کانوونی یەکەمی ١٩٨١ . ز

# بەشی یەکەم

[ کاتەکە وەرزی زستانە ، تەم و مژێکی خەست دنیای داپۆشیوە ..
باوکی « ئـازاد » یش بـە قووڵ چۆتـە دڵغـەوە ، زۆر بـە وردیی بیر ئەکاتەوە لە داهاتو و پاشەڕۆژی ئیسلام ، لەم بیر و ئەندێشەیەدا ئەژیا لـە پڕێکا هەناسەیـەکی چڕە دوو ئەلێن لـە دەمـی دەرئـەچێ و دەرد و نەخۆشیەکی زۆری کۆمەڵ هەڵئەڕێژێ .

ئازادی قوتابی زیرەکیش پێی‌خۆشە بـەشداریی باوکی بکات بۆ چارەسەرکردنی ئەو دەرد و نەخۆشیانـە ، بـۆیە خـۆی بـۆ ناگیرێ و دوابەدوای باوکی ئەکەوێتە گفتوگۆ و پرسیار لە باوکی .. ] .

**باوك :** لەم کاتەدا کە ڕۆشنایی لە بوونەوەردا نەماوە ..! لەم کاتەدا کە تاریکیی و تەپ و تۆز و گەردەلوول بەری تاسۆی ژیانی داگرتووە ..!

لەم کاتەدا کە نەدامەتیی و نەگبەتیی ڕەشماڵی خۆیان داداوە .. !

لەم کاتەدا خەم و پەژارە چیغ و چەڵای داکوتاوە .. !

لەم کاتەدا کـە ناڵە و هـاواری نوڕ کوژراوان و کۆس کەوتـوان گەیشتۆتە ئاسمان .. !

لەم کاتەدا کە هەنیسکی باوك کوژراوان دڵ لە جێگە دەردێنێ .. !!

لەم کاتەدا کـە خوشـکە براکوژراوەکـان ڕەنگیان لـە زەردەی ئێوارە دابڕیوە .. !!

لەم کاتەدا کە ناڵە و نرکەی هەژاران و مافخوراوان دنیای کـەڕ کردووە .. !

لەم کاتەدا کە سەدان بێتاوان لە جیهاندا لـە بەندیخانەکانـدا کۆت و زنجیر کراون !

لەم کاتەدا کە تەرازووی داد و ڕاستیی خراوەتە پشت گوێ .. !!

لەم کاتەدا کە ستەمی ستەمکاران بەری خۆری گرتووە .. !

لەم کاتانەدا .. حەپەسام و دەستەوسان وەستام و .. ئینجا کەوتە بیر و خەیاڵمەوە :ـ

دەرمانێك .. چارەسەرێك .. تروسکایەك ..

ڕرۆشنایەك .. سنورێك بلێی بێت بۆ ئەمانــە .. ؟ ! جا ئەگــەر بێت داخۆ لە کام وڵات دەست کەوێ ؟ خـۆ ئەوەندەش زۆرن ئەوانەی بانگیش بە هەق و ڕاستییەوە ئـەکەن ، وەلافی یەکسانیی و دادپەروەریی لێئەدەن ! دنیایان پڕکردووە کـەچی بـە تەلیسکوب و میکرۆسـکۆبیش بگەڕێی پێی بلێیت سۆز... داد.. ڕاستیی دەسبست ناکەوێت ..!؟نازانم چی بکەم .. ؟ ! سەردڵم گیراوە لەتاو خەفەتا بۆ ئەو هەموو نەدامەتیانە .. کێ بێ بتوانێ هەنیسکی ئەو کۆرپانە دابمر کێنێتەوە .. ؟ کێ بێ ببێ بـە هۆی دامرکاندنی کڵپە و قرچەی دڵە سووتاوەکان .. ؟ !

کێ بێ هێمنی و ئاسایش بخاتەوە سەرزەویی ، تا بەشکوم وای لێ بێت کەئادەمیزاد سەر و ماڵ و سامان و شەرەف و ئـەقڵ و ژیریی پارێزراو بێت .. ؟ کێ بێ ڕێز و نرخی ئادەمیزاد ڕاگیر بکات .. ؟

کێ بێ پیاو کوشتن ، جـەردەیی ، دزیی ، ڕەش و ڕووت کردن .. گزیی و خەیانــەت ، نەنگ گرتن ، ڕێگەگرتن .. تالان و بڕۆ ، دەســت درێژیی ، زوڵموسـتەم ، بـەرتیل ، ڕەگەزپـەرستیی ، نەژاد پـەرستیی ، دەمارگیریی .. هۆزایەتیی ، چینایەتیی .. خاكپەرستیی ، مرۆڤ پەرستیی خـودپـەرسـتیی .. ژێردەسـتیی ، بێ شـەرمیی وێڵی ، بێ دادیی ، بێ سـەربـەسـتیی .. نادروسـتیی .. نارەوایی .. مافخـوراویی ... دەربەدەریی .. بێیەکسانیی .. کێ بێ نەوەکانی ئادەم ڕزگار بکات لە مانە ، وە لە سەدەها گیروگرفتی تر .. ؟

کێ بێ دانیشتوانی ئەم ئەستێرەی زەویی یە لەم لێنانە بێنێتە دەرەوە ..؟

دوژمنایەتیی ، ناکۆکیی و ئاژاوە و ئاشووبە هەڵگرێ لە ناو کۆمەڵا .. ؟ ! کێ بێ بتوانێ ئامانج و داخواز و مەبەست و راز و نیازی هەموو بەرەی ئادەمیی بکانە یەك ؟ لە پێناوی یەك شتا بمرێن و بژین .. ؟

کێ بێ ئادەمیزاد لە ئەم بەر و ئەو بەرکردن رزگار کات .. ؟ نەهێڵێ دوای ئەم و ئەو بکەوێ و تە نها بە هێڵە ڕاستەکەدا بڕوا .. ؟ !

ئازاد : ( دوای ئەوەی باوکی قسەکەی تەواو کرد و هەناسەیەکی دا ) بابە گیان بە دەم ئەم و ئەوە وە بیستوومە کە ( ئەمەریکا ) زۆر پێشکەوتووە ، وە خەڵکیی زۆر باسی ئەکەن ، جا بە پێی ئەوە لە وانەیە ئەو چارەسەری ئەم دەردانەمان بۆ بکات ..

باوك : ئازاد گیان ، تکات لێ ئەکەم دوای قسەی ئەم وئەو مەکەوە ، وە تا خۆت ئەو وتەیە هەڵ نەسەنگێنی و بە تەرازووی راستیی نەیکێشی بەڵێ بۆ کەس مەکە .. ! چونکە ئەوەتە ئەمەریکا زۆر باس و خوازی هەیە ، کەچی تا بناگوێشی لە گێر و گرفتدا چەقیوە .. ئەوەتە تا ئێستا یش چارەسەری مەسەلەی ڕەش پێستەکانی نەکردووە .. ! وە پێی بڵێیت سۆز و بە زەیی تیا بەرچاو نا کەوێت .. ! « چونکە ئەمەریکا ئەوەیە کە لە شارێکیا [١٨٠] تەرم کوێزرایەوە بۆ کۆڕ ، لە بنی دەریای ( پاسەڤیك ) بوو ؛ ئەم تەرمانە بریتیی بوون لە [ ٤١٨ ] سنووقی پۆلا ، هەر یەکەیان [ ٢٠ ]رۆکێتی گازی کوشندەی تێدا بوو ! واتە زیاتر لە [ ١٢ ] هەزار رۆکێتی دژی مرۆڤ .. بەڵێ .. خرانە بنی دەریا ، چونکە ئەمەریکا بڕیاری دابوو لە دەستی ئەم جۆرە چەکانە رزگاری بێت ، نەك لە بەر ئەوە حەزی لە ئاشتی یە و نایەوێ کەسیان پێ بکوژێ ، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو چونکە ( چەکی میکرۆبایی دروستکردووە ) واتە مکیرۆب پەروەردە ئەکات و دەیکات بە چەك و دەیتەقێنێ بۆ کوشتنی ملێونەها بە یەك چرکە .. چونکە مۆدێلی تازە تری هێناوە بۆ کوشتن و چەکی

( تۆلاریما ) ی دروستکر دووە ، بە لێ •• ئەو رۆکێتانەی فڕێدا ، چونکە چەکی ( هایدرۆجینی هەیە لە ناو مانگی دەستکردا بە تەقینەوەی کەرتێکی زەویی دەکات بە دەریایەکی تازە •• هەڵگرتنی تەرمی ئەو رۆکێتانە و فڕێدانیان ـ ئازاد گیان ـ مانای فڕێدانی بەزەیی ، مانای رزگار بوونی لە دەسست دڵ نەرمیی یە !! » •

رۆڵە گیان ئـەوەیش ئـەمـەریکا ••!! دەی ئیتر دەرمـانی ئـەم دەردانەی ئێمەی چۆن پێ ئـەکرێ •• ؟ ئەوەتـە تا ئێستایسش مرۆڤـە رەش پێستەکان بۆیان نیە برۆنـە چێشتخانەی سپی پێستەکان ، وە یا لـە قوتابخانەکانیاندا بخوێنن •• !! تەنانەت هەر ئۆتۆمۆبیلێك سپی پێستی تێدا بێت رەش پێست بۆی نیە نزیکی بکەوێتەوە [1] •••

ئازاد : چۆن ئێستا یش لەم سەدەی بیستەمـەدا مرۆڤ ئەوەندە لای ئەوان بێ نرخـە •• ؟ !

**باوك :** بێ درۆو بێ پێچ و پەنا ، ئەمـە مافی مرۆڤـە لە ئەمەریکای سەدەی بیستەمدا ، کەچی هێشتای حەیا و شەرم نایکرێ و لاف و گەزافی ( ماف ) لێ ئەدات •• !! •

**ئازاد :** کەوابوو ئەو وتەیـە کە لە سـەر زاری هـەندێ کەسـە ! « ئەمەریکای پێشکەوتن خواز » شستێکی بێ ناوەڕۆکە •• ؟ !

**باوك :** بەڵێ •• رۆڵە گیان وەك ئەڵێن « دەنگی دەهۆڵ لـە دوور خۆشە » • ئەگینە ئەمەریکایەك نەتوانێ چارەسەری دەردی خۆی بکات •• چۆن چارەسەری گەلانی تریبێ ئەکرێت •• ؟!!

**ئازاد :** بابە گیان : فەرەنسەیش زۆر ناو بانگی هـەیە ، تەنانەت بۆتە رووگەی هـەندێ کەس •• ! بلێی چارەی ئـەم نـەخۆشینانـەمان نەکات •• ؟

---

(١) هذا نبيك ياولدي لـ ١٦٠ مامۆستا محمود غەریب •

**باوك :** رۆڵە گیان پێشینان وتوویانە : « کەچەڵ ئەگەر حەکیم بێت دەرمانی سەری خۆی ئەکات » •

فەرەنسە ئەو فەرەنسە نیە کە لە ساڵەکانی یەکەم و دووەمی جەنگی جیهانی یەکەمدا [ ٧٥٠٠٠ ] هەزار کەسی نارد بۆ نەخۆشخانەکان بە هۆی نەخۆشی (سووزەنەکە)وە •• ئەمەیش لە ئەنجامی بەرەڵلایی و بێ رەووشتیدا ••[1] » ئەگەر دەوڵەتێك خاوەنی ڕەوشتی جوامێری و مرۆڤایەتی بێ •• چۆن بەوجۆرە بەر بەرەڵلا ئەکات بۆ گەلو نیشتمانیی تا بچەقێنە قوڕاو و لیتەی تاوانی خۆیان •• ؟ ! •

**ئازاد :** بابە گیان دەی ئیتر هەر ئاوا دەستە ئەژنۆ دابنیشین •• ؟ ! تا ئەمرین بە دەردی خۆمانەوە بتلێنەوەو مل لار بگرین •• سەر دابخەین بێ چارەسەر ؟ ئەی بۆ سەرێك لە دەرمانگاکانی وولاتی ( ڕووس ) یىش نەدەین ، بەڵکو ئەمە خوایە •• چارەیەکمان دەستکەوێ •• ! خۆ زۆر کەس بافیشی پێوە ئەکات و ئەڵێت رووس وایە و وایە ••!!

**باوك :** رۆڵە گیان زۆر حەز ئەکەم بە چارەسەر •• بە هێمنی •• بە ئاسایش رۆڵە نێرینەکەم ئەڵێت بەڵکو چارەسەرمان لە ( سۆڤیەت ) دەست کەوێ !! ئەوە بۆیە وا ئە ڵێت هاوارەکەی (خرۆشۆف) تنەبیستووە کە ئەڵێت :

« پاشەڕۆژی رووس [2] لە گێژاوێکی سامناك دایە •• بە هۆی بێ ڕەوشتیەوە • ئازاد گیان ئەو خۆی لە گێژاوێکی سامناکدا بژیی و نەتوانێ هێمنی و ئاسایش بۆ خۆی شەقام گیر بکات •• چۆن ئەتوانێ کامەرانیی و ئاسوودەیی بۆ ئێمە بگێڕێتەوە ••؟!

---

(١) الإســـلام لـ٢١٧ •

(٢) أخلاقنا أو الدمار لـ ٢٤ •

سەرەرای ئەمانەیش ئەو بێ بەزەیی‌یە و شوفێنیەتەی ئەو بوویەتی مێژوو لاپەڕەکانی خۆی پێ ڕەش کردووە • گوێ بگرە تەنها نموونەیەکت بۆ باس بکەم ، راپۆرتێك ئەڵێت : « تەنها لە بەر خاتری سەقام بوونی شیوعیەت لە ولاتی روس دا [ ١٩ر٠٠٠ر٠٠٠ ] ملیۆن کەس کوژرا ••!! وە بڕیاری سزای جۆر بە جۆر درا بەسەر [٢٠٠٠ر٠٠٠ر٠٠٠] ملیۆن کەس‌دا وە ( ٤٠٠٠ر٠٠٠ر٠٠٠ ) تا ( ٥ر٠٠٠ر٠٠٠ ) ملیۆن کەس لە ولات نەفی کران و دوور خرانەوە • !!

کاکە ئازاد گیان ئایا ئەم ژمارانە مانایان چیە ••؟! ئایا نرخ و بەهای ئادەمیزاد ماوە بە لایەوە ؟ ئایا ولاتێکی ئاوا جێگەی پەنایە • ؟ جێگەی ئومێدە ••! جێگەی باڵ پێوەدانە •؟

ئایا کۆمەڵ کردن بە قوربانیی لە پێناوی جێگیر بوونی ئامێکدا راستە •• ؟ ! •

بابە گیان وا دیارە بە جارێ ئەستێرەی زەویی شیرازەی بچراوە و دوور کەوتۆتەوە لە ڕەوشتی بەرزی مرۆڤایەتیی •• !

رۆڵە گیان ••• بەرەڵایی و بێ شەرمیی هەر لە وەدا نیە ••• گەیشتۆتە پلەیەك نزیکە بە تەواویی ریشەکەنی ئادەمیزاد بکات •

ئەوەتە لە گۆڤاری ( المختار ) ١ ژمارە [٢٢٣]ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٤٠ لاپەڕە ٣٦دا هاتووە و ئەڵێت : [ ٨٠ر٠٠٠ ] هەزار منداڵ بە شەرواڵ پیسیی لە دایك بوون !! نیوەیان ئەو کیژانەن کە هێشتا تەمەنیان لە [١٥ ، ١٩] ساڵایە •

وە هەروەها قازی ( لندیسی ) ئەڵێت :

---

(١) الاسلام •

« هەموو ساڵێك ملیۆنێك ئاوەڵەمە – چینن – بــە لای کەمەوە فڕێ ئەدرێ •• ! وە بە هەزارەها مناڵ ئەکوژرێن دەسست بەجێ کــە لە دایك ئەبن [1] ••

وە لــە ئەڵەمانیا دا ئەگــەر رێك بکــەوێ کیژۆڵەیــەك بــە کچێتی بمێنێتەوە ئەوە نەنگێکی زۆر زۆر رووی تێ ئەکات ، وە لە ناو هاوسەرانیا بە چاوی رێزەوە تەماشا ناکرێ •• !!

بە تایبەت لەم سەدەدا کە هۆ بۆ بەربەستکردنی مناڵ بوون زۆرە ، بە شیۆەیەك لە هەموو سەرە رێگایەکدا دەست ئەکەوێ • لە وولاتی (سوید) یشدا ئەو ئافرەتانەی کە بە ئارەزووی خۆیــان ڕائەبوێرن رێژەیان زۆر پتر ترە لە وانەیان کە بە یاسا مێرد ئەکەن ، بێجگە لەمەیش لــە ٢٠٪ی کچ و کوڕ بە شێوەیەکی نارەوا یەك ئەکەون •• !!

ئەمە لەلایەکەوە لە لایەکی ترەوە بــە پێی سەرژمێریی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی رێژەی ( تەڵاق ) لەوێ لە هەموو وولاتێك زیاترە •

وە لە ( ڤینا ) هەواڵەکانی وا رائەگەیەنن کــە نزیکــە بەم زوانــە ئافرەت ببێ بە ( جنسس ) یکیی سێهــەم ئەمەیش زك نەکردنی ئافرەتــە بە بێ ئەوەی هۆیەك لە هۆیەکانی مناڵ نەبوون بێ،بێجگە تێکەڵاوی کردنی پیاو بە شێوەیەکی زۆر و نابەسەند[1] •

بابە گیان •• خوای گەورە سۆزی خۆی بڕێژێ بــە سەرتا وامنت بــە ڕاستی تێگــەیاند لــەو وولاتانــە ، چونکــە تــا ئێستاش وامزا نیوە سەرچاوەی سۆزن •• خاوەن بەزەیین بۆ ئەوەی زیاتر دوژمنانی ئیسلام• و قەڵاچۆکەرانی گرۆی ئادەمیزاد بناسین •• حەز ئەکەم باسێکی وڵاتی [چین‌ویوگوسلاڤیا]یشم بۆ بکەیت •

---

(١) الاســـلام •

(١) الاســـلام لـ٢١٧

رۆڵە شیرینەکەم تەنھا خاڵێکی بچووکی وولاتی « چین » ت بۆ ئەگێرمەوە ، جارێکیان هێرشێکی نا پیاوانەی برد بۆ سەر موسڵمانەکانی (ترکستان) لەو هێرشەدا (٢٠) هەزار مزگەوتی موسڵمانەکانی ئەوێیی رووخاند [٢] . !!

وولاتی (یوگسلافیا) یش زیاتر نەبێت لەوان کەمتر نیە چونکە دوای جەنگی دووەمی جیھانیی گشتیی تا ئەمڕۆ ( ١٠٠٠٠٠٠ر١٠٠٠ ) ملیۆن موسڵمانی بێتاوانی لە ناو برد [٣] .. ، .

ئەمانەن .. ئێمە لەم دوورەوە مرخمان چۆتە سەلایان و ئەمانەوێ بیانکەین بە مامۆستای خۆمان .. پێ بخەینە جێگە پێیان .. دەم بخەینە جێگەی دەمیان تەنانەت قسەو گۆرانی و جل و بەرگیان پەسەندە لامان .. !!

ئازادگیان وولاتێ پیاوە هەڵکەوتووەکانی وەك ( کارل مارکس ) بڵێن :

« سێ یەکی هەمووی ئادەمیزاوی جیھان ئەکەم بە قوربانی لە پێناوی دامەزراندن و جێگیر بوونی ( شیوعیەت ) لە جیھاندا [١] .. ، وولاتێ ئەوەندە بێ بەزەیی بێت ، وە ئازایی و سەربەستیی ( ئایینداریی ) تیا نەبێت و هەڵسێ (٣٠) هەزار مزگەوت بروخێنێ و جێگاکانیان بکات بە تیاترۆخانە و تەویلەی ئاژەڵ و سەلوێنگە..! چۆن ئەبێ ئەو وولاتە پشتی پێ ببەسرێت و هانای بۆ ببرێ بۆ چارەسەریی ؟ ! .

---

(٢) الاسلام یقیناً لا تلقیناً لـ٢٦٩ دکتور صابر طعیمه .

(٣) تربیة الاولاد في الاسلام بەشی سێهەم ژمارە (٢) لـ ١٧٥ عبدالله علوان .

**ئازاد :** بابه گیان •• خوا یارمەتیت بدات وا ئەم راستییانەت خستە پێش چاومان •• بڕوا بکە زۆربەی خەڵك دوای دیعایـە و چـاوو ڕاو، کەوتووە •• گوێ ئەگرێ باس باسی ئەمەریکایە ، رووسە ، چینە ، هیندە، وە •• ، ئێمەیش بە نەشارەزایی دوایان ئەکەوین •• ! من نەمزانیوە ئەوانە ئەوەندە درۆندەن و ئەوەندە دژی کۆمەڵی ئادەمیزادن ، ئـەگینە قـەت ئەڵێم باسەرێك لە وانەیسش بدەین •• ؟ !

**باوك :** کۆمەڵێك ئەوە سۆز و بەزەیی بێت بەرامبەر بە سەربەستیی و ئازادیی مرۆڤ، لەلات مسۆگەر بێت •• ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تەپە دووکەڵ خەستر و چڕ تر ئەبێت ، ئەگەر هۆیەکی بۆ نەدۆزرێتەوە و سنوورێکی بۆ دانەنرێ •

ئازیزەکەم سەرسام نەمێنی لەم جۆرە کردەوانە چونکە پیشەی باو باپیریان بووە ، ڕۆڵەی باوکی خۆیانن ••!!
وە پەیرەوی (هۆلاکۆ)ی تـەتار ئەکـەن ، کاتێ هێرشە نا پیاوانـەکەی بردە سەر بەغدا ساڵی (٦٥٦)ی کۆچی • بەغدای ئارامگەی لێقەوماوان بەغدای بارەگای پیاوچاکان •• بەغدای مەڵبەندی زانست و زانیاریی •• بەغدای پەناگای هەزاران ، ئەم بەغدایە بووبە دەریاچەیەکی خوێن ••!

ئازاد گیان ؛ حەز ئەکەم لێرەدا کورتە مێژوویەکی ئەو کارەساتەت بۆ باس بکەم بۆ ئەوەی قەت بە هیوای سۆز و بەزەیی نەبیت لەو جـۆرە دەوڵەتانەوە و بە قسەی ئەم و ئەویش نەخەڵە تێیت :

« هۆلاکۆی دڕندە هێرشی هێنایە سـەر ئەم شـارە ـ بەغـدا ـ و هاشاوڵی ناپیاوانەی بۆ برد •• بەڵێ •• لەو هێرشەدا هەرچی بەردەست کەوت ـ لە پیاو و ئافرەت ، لە منداڵ و لاو و پیر ـ بێ بەزەییانە گرتی و کوشتی ••! هەرچیش بۆی کرا خۆی حەشاردا لە ناو تەویلەی ئاژەڵ و سەلوێنگە و شوێنە پیسەکاندا •• ! ئەم کردەوە ناپەسەندە چەند ڕۆژێ درێژەی کێشاو خەڵکێکی زۆریان بێ حورمەت کرد ••!

کۆڵیان نەدا تا لافاوی خوێن لە کۆڵانەکانا هەڵسا

**انا لله وانا الیه راجعون**

خۆ ئەگەر کەسێ پەنای بردبایە بۆ مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکانی تر ئەوە لەوان زیاتر ئازار و ئەزیەتیان ئەکردن .. ئازاد گیان ؛ بێجگە لە گاور و جوولەکە و ئەوانەی نۆکەریان بۆ ئەکردن و چڵکاو خۆریان بوون کەسی تر دەرنەچوو !! چونکە گاور و جوولەکەکان خۆیان بوون بە چاوساغی تەتارەکان و هێنانیان بۆ ناو پایتەختی (خەلافەی) موسڵمانەکان .. وە هەرچی کون و قوژبنی شارەکە بوو پیشانیان دان ، وە بە ئاشکرا بەشداریی جەنگەکەیان کرد و پێشوازیەکی گەرمیان لێ کردن[1] .

بەڵێ ئازاد گیان ؛ جەنگ گەرم بوو ولا فاوی خوێن هەڵسا لە کۆڵانەکانی بەغدادا .. سەر ئەنجام خەلیفەی موسڵمانان ـ المستعصم بالله ـ شەهید کراو ماڵ و خێزانی تیاچوو وسێ خوشکە کەیشی دیل کران . ئەم کارەساتە (٤٠) چل رۆژی خایاند ، ئینجا ئەو بەغدایەی کە لە هەموو شارەکان قەڵەباڵغ تر بوو وەك وێرانەی لێهات !!

هەرخەڵك بوو لە بارەگای ( خەلافەت ) ئەهێنرایە دەرەوە و بەرەو گۆڕستان ئەبران و سەریان ئەبڕین .. !! و هەر کچ و کەنیزەکێك بە کەڵك بهاتایە دیلیان ئەکرد و ئەیان هێشتەوە .

وە هەروەها مامۆستای راز و نیاز و جێگەی پرس و راوێژی خەلیفە ـ صدر الدین عدلی کوری نەیار ـ یشیان شەهید کرد .. هەر وەك چەندەها دواندەرو پێشەوا و حافیزی قورئانیان لە ناو برد ، وە چەندان مانگ جومعە و جەماعەت هەڵگیرا لە شاری بەغدادا ..!!

**ئازاد : ئای بابە گیان ـ وەك موسڵمانێك هەست بە ئازاری برای ئایینی خۆی بکات ـ بە تەواویی ئێشم پێگە یشت و مووی لەشم گرژ بوو !! بابە**

---

١ ـ **لەگەڵ هەندێ بەناو موسوڵمانی دوشمنی کۆنو نوێیی ئیسلام لە تایەفەی نصیری‌طوسی‌و ابن العلقمی ..!**

ئەی مێژوو نووسەکان ئاڵێن ژمارەی کوژراوان بە چەند کەس گەیشت..؟

**باوك :** مێژوو نووسەکان جیاوازیان هەیە لەم بارەوە **بڕیکیان** ئەڵێن (٨٠٠،٠٠٠) هەشت صەد هەزار کەس کوژرا ، له لایەکی ترەوە وتراوە هەزار هەزار واتە (١٠٠٠،٠٠٠)یەك ملیۆن کەس ..!! سەرچاوەیەکی تر ئەڵێت : ئەندازەی کوژرا و (٢٠٠٠،٠٠٠)دوو ملیۆن کەس بوو **( انا لله وانا الیه راجعون )** .

**ئازاد :** بابە گیان .. خەم و پەژارە و زویریم تا بێت زۆر ئەسێنێ تۆ و خوا ئەگەر باسێکی وڵاتی **(هندستان)**یشم بۆ ئەکەی،چونکه ئەویش ناوبانگی کەڵە دەوڵەتی هەیە ..!

**باوك :** ئازاد گیان ؛ ئەگەر ناوی خوات نەبردایە ، له وانه بوو خۆم لابدایە لە باسی وڵاتی **(هند)** چونکە بەڕاستی ئەوەی هیندییە بت پەرستەکان کردیان بە **(پاکستان)**ـ کاتێ جوێ بووەوە ـ لە کردەوەی نامرۆڤایەتی و شۆڤینیەتدا هیچ کەمتر نەبوو لە تاتاری کۆنە مامۆستایان ،چونکە ئەوەبوو لە پەلامارە دڕندەکەیدا بۆ سەر موسڵمانەکان (٨،٠٠٠،٠٠٠) ملیۆن موسڵمان ئاوارە و سەرگەردان بوون ! لەم هەشت ملیۆنە تەنها (٣،٠٠٠،٠٠٠) ملیۆنیان گەیشتنە نزیکی پاکستان ! ئیتر (٥٠٠،٠٠٠) ملیۆنەکەی تری لە ڕێگەدا گیانیان لە دەستدا ، چونکه عەسابە و چەتەکانی دەوڵەتی هیند ڕێگەیان پێگرتن هەر وەك بەرخ سەریان بڕین ...!! وە لاشەکانیان قەل و داڵ سەری تێکرد ، ئەمیش دوای شیرزە کردن و لووت و گوێ بڕینیان !! ئیتر با کارەساتی ئەو شەمەندەفەرە بووەستێ کە بڕیار وابوو (٥٠،٠٠٠) هەزار مووچە خۆری دەور و بەری **(هند)** بگوێزێتەوە بۆ پاکستان .. بەڵێ .. ئەم ژمارەیە کۆبوونەوە و سواری شەمەندەفەر بوون بڕیار وابوو بەو تونێلەدا بڕۆن کە ئەکەوێتە نێوان هندستان و پاکستان .

شەمەندەفەر کەوتە ڕێ ..لەولایشەوە چەندەرمە و چەتەکانی هیند ڕێگەیان پێگرتن و دەستیان لێکردنەوە ، سەرنجام ئەو پەنجا هەزار

کەسەیان شەل و پەتکرد و شپرز و داماویان کردن ..»[1] .

ئازاد گیان ؛ کۆمەڵی ئادەمیزاد زۆر کەمتر لە ودڕندە و پەلەوەرانە سەیر ئەکرێت کە لە (باغی ، ئاژەڵدا ـ حدیقة الحیوانات)ی دەوڵەتانا راگیر کراون بۆ سەیر و تەماشا کردن ..!!

چونکە ژیان و جێگە و رێگەیان زۆر زۆر مسۆگەر ترو رێك و پێك ترە لە چاو ئەو کۆمەڵە بێ دەسەڵاتەی ئەکەوێتە ژێر دەستی دەوڵەتێکی (علیمان)ی‌یەوە ، چونکە پەلەوەرەکان کاتێ بیانگوێزنەوە لەو شوێنەی خۆیانەوە بۆ شوێنێکی تر ، پێش ئەوەی لە جێگەی خۆیاندا بیان جووڵێن ژیان و رێگە و هۆی حەوانەوەیان بۆ تەواو ئەکەن ئینجا دەست ئەکەن بە گوێزانەوەیان ، دیسانەوە ئەم جێگە تازەیەیان ئەبێ زۆر زۆری ببێ بە سەر جێگە کۆنەکەیاندا .

**ئازاد :** بابە گیان .. بە راستیی لە سەرەتای فەرمووده‌کانتەوە تا ئێرە هەرچیت بۆ باسکردم یەك لە دوای یەك دڵ تەزێن تر بوو ، ئیتر بێ تاقەت بووم و ووزەم نەماو ناتوانم ئەم هەموو کارە نامرۆڤانە هەڵگرم .. دەسا خوایا زاناو رابەرێك بنێری بۆ گرۆی ئادەمیزادی سەرلێشێواوی بەد بەختی شوێن کەوتووی مادە .. دنیا پەرست .

**باوك :** رۆڵە گیان .. بەراستی هیچ نرخ و رێزێ نەماوە بۆ ئادەمیزاد ، چونکە بە کۆن و تازەوە بەربوونەتە میللەتە ماف خوراوەکان، هەژارەکان ... خۆ ئەگەر یەکێك داوای مافی رەوای خۆی بکات ، بەندیخانە ، ئەشکەنجە ، سزا کۆت و زنجیر ، وێرانکردنی وڵات ، گوللە، فرۆکە هەموو جۆرە چەکێکی بێ بەزەییانەی بۆ بەکار ئەهێنن..!!

با زۆر دوور نەرۆین و زۆریش نزیك پەنجە رانەکێشن بۆ کەس .. ئا ئەوە موسڵمانەکانی **(ئەفغانستان)** هەموو کەس ئاگای لێیانە و

---

(١) في ظلال القرآن بەرگی چوارەم ص١٥١ ـ ١٥٣

بسوویەتی کــه چیان بــه ســەراهات لــە لایەن (دەوڵــەتێکی هــەژار پەزێرەوە ••!!

ئازاد گیان ؛ دە ئیتر لە پەنای خوای گەورەدا بژیت ، وە بە هیوام ئەم راستییانە لە بیر نەبەیتەوە و بۆ هاوڕێ کانیشتی باس بکەی • وا کاتی نوێژیشە چاك وایە دەست نوێژەکــەمان تازە بکەینــەوە و تابانگ ئەبێت هەندێ قورئان لەبەر بکەین •

**ئازاد** : بابە گیان ، پەیمان بێت بە گوێت بکەم و بۆ خــەڵکیشی بگێڕمەوە ، وە ئیتر خۆم بکەم بە سەربازی قورئان و تەنیا لە خزمەتی قورئانا بژیم •

# دیمەنی دووەم

[ ئازادی قوتابیی ڕەوشت پاك لەم ماوەیەدا خەریك بوو بــە لــە بەرکردنی قورئانی پیرۆزەوە ، ئینجا بێ تاقەتی قســە خۆشەکانی باوکی بوو ؛ بۆیە بە پەلە پەل هاتەوە بۆ خزمەت باوکی و داوای لێکرد کــە هەر چۆنێکی کردووە ئەبێ چارەسەرێك بدۆزێتەوە بۆ نەخۆشییەکانی کۆمەڵ •• ] •

**ئازاد** : بابە گیان ، خۆت ئەزانی گەلێك گەڕاین بــە وڵاتاندا بۆ سنوورێك، بۆ ئەم هەموو پشێویی و ئاژاوەیە کە کەوتۆتە ناو کۆمەڵەوە••• ئەوەبوو دەستمان لێشۆری و هیچ دەرمان و چارەسەرمان نەدۆزییەوە••• چونکە هەر وڵاتێك گــەڕاین یــەك لــە یــەکتر خوێن مژتر و دڕندە تربوون سەبارەت بــە مرۆڤــە بەشخوراوەکان ! دە ئیتر نۆبەی ئــەوە نەهاتووە سەرێك لە ئیسلامیش بدەین ، تابزانین ئەوچۆنە و چ یاســا و سنوورێکی هەیە سەبارەت بەو نەگبەتی و نەدامەتیانە ••؟

**باوك :** ئازاد گیان ‥ پێم خۆشە پێش ئەوەی تەماشای **ئەو** خاڵانە بکەین کە ئیسلام دایناون بۆ بەرنامەی ژیان ، بەراوردێ بکەین بۆ ئەوەی بزانین ئەگەر شوێنێ ‥ وڵاتێ ‥ کەرتێکی زەویی ، کە ئیسلامی تیا بووبێت چۆن رەفتاری کردووە لە گەڵ دانیشتوانی ئەو جێگایەدا ‥ وە هەر وەها کاتێ کە ئیسلامی تیانەمابێت ، واتە دوژمنان حوکمی قورئانیان تیا هەڵگرتبێ ‥ چۆن دوای ئەوە قەڵاچۆیان کردون و سەربەستیی و ئازادیان لێ زەوت کراوە ‥؟!

گوێ بگرە با تەنها نموونەیەکت بۆ باس بکەم :ـ

« کاتێ موسڵمانەکان **(ئەندەلوس)یان** خستە ژێر ئاڵای ئیسلام ، ملیۆنەها کەس هاتنە ژێر ئاڵای قورئان ‥، بەڵام کاتێ خوانەناسان حوکمی قورئانیان لە ناوا هەڵگرتن ، دەستیان کرد بە ئەشکەنجە و ئازار !! بڕوا بکە چەند سەدەیەك موسڵمانیان تیا یاساغ کرد ، مەگەر پێیان نەزانایە ئەگینە لە ناویان دەبردن !!»

وە هەروەها **(میصر)** و شارەکانی **(شام)** خرانە ژێر حوکمی ئیسلامەوە ، واتە ئیسلام فەرمانڕەوابوو ، لە گەڵ ئەوەیشدا چەندەها (گاوری) تیا ئەژیا بە ئازادیی و سەربەستیی و بێ ئەوەی کەسێك زۆریان لێ بکات بۆ گۆڕینی بیرو بڕوایان ‥ چ جای کوشتن و بڕین‥

یا وڵاتی **(هیند)** چەند سەدەیەك لە ژێر چاودێری ئیسلاما ئەژیا ، وە ئیسلام دەستەڵاتی بووکە تەنها کەسێ نەهێڵێتەوە کە سەرپێچیان بکات ‥ بەڵام لە گەڵ ئەوەیشا تاکە رووداوێك لەم بارەیەوە تۆمار نەکراوە ‥ »[1] موسڵمانەکان ئابە و جۆرە ئەجووڵانەوە و چاودێریی خەڵکیان ئەکرد ، بەڵام ناموسڵمانەکان هیچ درێغیان نەکرد لە زەوت کردنی سەربەستیی بیر و بواوڕ و قەڵاچۆ کردنی شوێنە پیرۆزەکانیان‥

---

(١) **الاسلام ص٢١٢**

« ئەندازەیەکی زۆر مزگەوت و کەنیستەیان ڕووخان وە (٥٠،٠٠٠،٠٠٠)

بەنجا ملیۆن موسڵمان - کە لەوێ بوون - ئێستا تەنها $\frac{١}{١٠}$

یان ماون .. »(٢) .

ئازاد گیان .. ئەمانە هەموو لەواهیێن بۆ داد و سۆزی ئیسلام و بۆ دڕندەیی و ستەمکاریی نا موسڵمان .

**ئازاد** : بابە گیان .. وا دەر ئەکەوێ دەرمانمان .. چارەسەرمان تەنها لای ئیسلام بێت ، چونکە ڕێباز و ڕژێمێك ئەوەندە بە سۆز و بە داد بێ ، وە ئلیسە و دێر و کەنشتەکان نەڕووخێنێ ، وە زۆر لە کەس نەتات بۆوار هێنان لە ئاینەکەی و چوونە سەرئاینی ئیسلام .. دیارە ئەو بەرنامە و ڕچەیە خاوەنی سەربەستیی و ئازادیە بۆ کەل و نەتەوەکانی تریش .

بابە گیان .. وا دەرکەوت ئەو دەوڵەتانە کە بوونەتە ڕووگەی هەندێ کەس ناتوانن چارەسەری نەخۆشیی ئێمە بکەن .. باشە ئەی ئەبێ هۆی ئەم نەکبەتی و نەدامەتیانەی زەویی داپۆشیوە چی بێ ..؟!

**باوك** : ڕۆڵە شیرینەکەم بە شێوەیەکی کشتی هۆی ئەو هەموو تاوان و زوڵم و ستەمەی ئەکرێ لە خەڵکی ، بەرەڵلا کردن و نەپرسینەوەی لاوەکانە ، چونکە ئەوان بەردی بناغەن ، وە کۆمەڵ هەمووی لەوان پێك هاتووە و دەوڵەت بەوان پڕ ئەبێتەوە .. وەك دەزگاکان نەخۆشخانەکان.. قوتابخانەکان، وەزارەتەکان ئەنجوومەنەکان، سەربازگەکان ، وە هەروەها ..

ئازاد گیان ؛ ئەگەر بە پەیرەویی و پەروەردەیەکی ڕێك و پێك بێنە ناو کۆمەڵەوە ، ئیتر هەموو کەس هەست بە ئەرکی سەرشانی خۆی ئەکات ، وە هەریەکەیان ئەبێ بە سەدێکی پۆڵایین لە بەردەم دوژمنانا ،

---

(٢) الاسلام ص٢١٣

بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە هەریەکەیان گیای دۆڵێك بخوات و باسی شوێنێ بکات ، وە بەریان بۆ بەرەڵابکرێ و هۆی گومڕایی‌یان بۆ فراوان بکرێ و گوێ بە ڕەوشتیان نەدرێ ..

ئەوە ئەبێ بە ماوەیەکی زۆر نزیك سەرانەی ئەو بەرەڵاییە بدرێت و بینە ژێر دەستەی دوژمن بێ ئەمەی کەسێ داچڵەکێ ..!!
گوێ بگرە لە **(مارشال پیتاڵ)** سەرەك کۆماری فەرەنسە .. لێیان پرسی: هۆی چیبوو هێڵی **(ماجینو)** پتر لە چاو تروکاندنێك تێشکا لە بەردەم (ئەڵمانیا)دا ...! سەرۆك ووتی :

« ڕاستیەکەی ئەمە بوو ، فەرەنسە بەڵێ .. خاوەنی چەکی ئاگر و ئاسن بوو .. بەڵام لە رەوشتی بەرز و پاك بێ بەش بوو ...!! »

**ئازاد:** بابە گیان؛ دیارە پێش ئەوەی فەرەنسە بە چۆکابێت پەلایەوە وا بوو تەنها چەکی ئاگر و ئاسن بەسە بۆ سەرباز و ئەفسەرەکان .. واتە لەشکر پێویستیی بە **(رەوشت)** نییە .

**باوك :** بەڵێ ئازاز گیان، ئەوانیش و قوتابییەکانیشیان رایان وایە!! بۆیە پیاوەکانی دەوڵەت ، واتە ئەوانەی دەست و پێی میرین هەر خەریکی ڕابواردن و خۆ ساف و لووس دانن ...! ئەوەتە کاتێ لەشکری ئەڵەمان دای بە سەرقەڵا و کۆشکەکانی فەرەنسەدا **(سەرەك‌وەزیرەکانی)** لە گەڵ ئافرەتێکی سەلیتەدا خەریکی رابواردن بوو[1] .. » جا رۆڵە شیرینەکەم ئەگەر پیاوە گەورەکانی دەوڵەت تا بەو جۆرە دەست پیس و دەم پیس و شەرواڵ پیس بن تۆ و خوا ئەبێ خەڵکەکەی تر چۆن بێت ..؟
**(کەنەدی)** سەرەك کۆماری وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ساڵی ١٩٦٢ی ڕاینی هاواری لێ بەرزبوویەوە سەبارەت بە لاواز بوونیان بەهۆی بەرەڵاییەوە ، ئەمەیش دوای ئەوەی سەر ژمێریەك کرا بۆ سەربازیی تەماشایان کرد ٧/٦یان بە کەڵك نەئەهاتن لە بەر لاوازیی و نەخۆشیی تەنی و دەروونیان .

---

(١) أخلاقنا أو الدمار ص١٩ـ٢٠

ئازیزەکەم :

نـەهێشتنی خوورەوشتی لاوەکـان ئـاوات و هیـوای زەهـراوی دوژمنانە ٠٠ ئاگات لەو برگەیە کە لـە **(پروتوکولات)** ی جوولە کە کاندا هاتووە ئەڵێت :

« پێویسـتی سـەرشانمانـە تێکۆشـین بۆ رووخـاندنی خـوو و رەوشت ، ئینجا دوایی زۆر بە ئاسانی سەرئەکەوین ، **(فرۆید)** لە ئێمەیە بۆیە درێژە ئەدات بە داوەکەی و پەیوەندیی سێکسی پێشکەش ئـەکات بۆ ئـەوەی لای لاوەکان هیچ شتێکی خـاوەن نرخ نـەمێنێتەوە تـەنها تێرکردنی دەماری (جنسیی) نەبێ ٠٠! ئینجا دوای ئـەوە بـە تەواویی رەوشت ئەڕوخێ[1] ٠٠ » ٠ واتـە لاوەکان ئەبەسنەوە بـە رابواردن و سینەما و سەماو سووڕدانەوە ٠٠ تا بەنج ئەبن و هەستی مەردایەتیان لا نامێنێ ، ئینجا پەلامار دێنن بۆ ئاوو خاك و وڵات و نیشتمان و ئایین ، بێ ئەوەی لە کەسێ بترسن و هاشاوڵیان بۆ بێنێ ٠٠!!

**ئازاد** : بابە گیان : وادەرئەکـەوێ ترسی تەواویان لـە لاوەکانـە بۆیە ئەوەندە هەوڵ ئەدەن بۆ سەرکەرم کردنیان ٠٠!

**باوك** : رۆڵەکەم ئەی ئەگەر لـە لاو نەترسن لـە کێ بترسن ٠٠؟ خۆ پیر والـەوێ نانیشی پێ ناخورێ ، ئیتر کافر چۆن لێی بترسێت ٠! وە چۆن تەمای تێ بکات تا هەڵی خەڵەتێنێ[1] ٠٠! ئازاد گیان بڕوا بکە پارەیش بدات نایانەوێ ٠٠ ئەوان بەرخی دابەستەیان ئەوێ و بیکەن بە قوربانی خۆیان نەك پیر و پەککەوتە بەخێو بکات ٠

بۆیـە پرتۆکۆلات ئـەڵێـت : « چـوونـە هـەر شـوێنێـك هـۆی رابواردن و مـەستبوونی لاوەکان زۆر بکـەن ئەگـەر چی بـە

---

(١) تربية الاولاد في الاسلام ص٢٤٤ بەشی سێهەم ، ژمارە (٢)

(١) واتە پیری ساکار و دوور لە بەرنامەی خوا ٠

ملیۆنەها دۆلاری تێ بچێت ، تا بەشکوم بەوەوە خەریك بن و ئاگایان لە هیچی تر نەمێنێ ... .

**ئازاد :** بابە گیان .. دیارە چاك تێگەیشتوون لەلاو بۆیە ئەوەندە هەوڵ ئەدەن و کۆشش ئەکەن بۆ لاوازکردنی خۆی و بیر و باوەڕی ، چونکە ئەزانن لاو بەردی بناغەی کۆمەڵە .. خێزانە .. دەوڵەتە .

**باوك :** ئەی ئازیزەکەم ئەم لاوانە هەرکامێکیان بگری لە پاشەڕۆژدا ئەبنە پارچەیەکی دەوڵەت ، ئیتر بچووك ، یا گەورە ، کەواتە بۆیە ئەوان ئەوەندە مەترسیی لێ ئەکەن و سەر لێشێواوی ئەکەن ، چونکە ئەگەر بە پێی نەخشەی ئیسلام پەروەردە بکرێ ئیتر ئەوان ناتوانن هەڵی خەڵەتێنن نە بە پارە و پوول ، نە بە هۆی رابواردن . خۆ ئەگەر بە نەخشەی ئەوان بجووڵێنەوە ئەبنە گورگ و پەلامار ئەدەنە ئێمە و ئەمانکەن بە قوربانی ئاغاکانیان !! هەر کاتێکیش جێگەیان پێ لەق بوو ڕائەکەن بۆ لای ئاغاکانیان ، دوای ئەوەی شوێنەوارێکی پیس و بۆگەنی ژەهراویی بەجێ دێڵن ..!!

**ئازاد :** بابەگیان فەرموودەکەت زۆر راستە .. زۆرم بیستووە سەرەك دەوڵەتی فلانە شوێن بۆ فلان جێگە هەڵهات و ئەوەندەیش دارایی فڕاندووە ..!!

باوکی بەڕێزم ـ وەك خۆت ئەزانی ـ ئەمانە کە بەڕێزت بەیانتکردن دەرد و نەخۆشییەکان بوون .. پێویستە دەرمانیش بکرێن ، چونکە پزیشك وەك نەخۆشیی دیاریی ئەکات ئەبێ دەرمانیشی بۆ بنوێنێ .

**باوك :** کوڕە شیرینەکەم چار هەر ئەوەیە کورپەکان بە شیری ئیسلام گۆش بکەین ، وە هەوڵ بدەین ئەخلاق و وێلێ قورئان بگرن ، چونکە وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد ـ شیریی هەر ولاتی بخۆن دزیی و جەردەیی و بەرەڵلایی و شەقاوەیی و خەیانەت و بەرتیل و فرۆشتنی ولات و سەرشۆڕیی هتد ؟ خوویان ئەبێت .

تەنها ئەخلاقی جوان چەکە بۆ پاشە ڕۆژ ، وە زەخیرەو پاشەکەوتە بۆ تەنگانە ، بۆیە خوا ـ جل جلالە ـ وەسفی پێغەمبەر ـ صلی الله علیە وسلم ـ ئەکات و ئەفەرموێ :

« **وانك لعلى خلق عظيم** » سورەی قەلەم ئایەتی ٦

بە مانای خاوەنی خوو ڕەووشتی بەرزین •• خاوەن سپاردەیت•• ڕاستین ـ بەدادیت ـ بە سۆزیت ـ خاوەن پەیمانیت •• وتەو کردارت یەکە •• کردار و نیازت یەکە •• ستەمکار نیت •• فێڵ بازنیت •• چاوو ڕاوکەر نیت •• ماڵی مەردم ناخۆیت •• خاوەنی ئەم وەسفانەیت لەگەڵ خۆتا لەگەڵ تاکدا •• لەگەڵ کۆمەڵدا •• لەگەڵ دەوڵەتدا •• لەگەڵ خوای خۆتا •

**ئازاد :** باوکی خۆشەویستم بەڕاستی تەنها خوای گەورە پایەو پلەی ئەو پێغەمبەرەی زانیوە •• چونکە ئێمە تەنها ئەوەندە ئەزانین کە پێغەمبەر ـ صلی الله علیە وسلم ـ

بابەگیان ـ وادیارە ئاینی پیرۆزی ئیسلام پێش هەموو شتێك گرنگی بە خووڕەوشت داوە ؟ بۆیە خوای گەورە بە (خلق) وەسفی پێغەمبەر ئەکات •

**باوك :** ئەی کوڕەکەم ئیسلام پێش هەموو شتێك ڕۆڵەکانی •• ئەندامەکانی لەسەر ڕەوشتی پاك و بەرز پەروەردە ئەکات •

نەتخوێندۆتەوە لەژیاننامەی پێغەمبەردا ـ صلی الله علیە وسلم ـ کە (٣) سێ ساڵی بێ وچان و پشووردان موسڵمانەکانی کۆئەکردەوە و دەرزی یەکتاپەرستیی و خووڕەوشتی دائەدان،چونکە مرۆڤ ئەگەر خاوەن سۆز بوو بیری لێپرسینەوەی خوای بوو ئیتر کاتێ سواری فڕۆکەی جەنگی ئەبێ بوردمانی هەژار و بێتاوان ناکات،واتە ئەو کاتەی کە خاوەنی

**(شیروتیر)** بووه چۆن ستەمی لـە هـەزاران نـەکردووە ٠٠ هـەر بـەو جۆرەیش کاتێ بوو خاوەنی بۆمبای (ئەتۆم و نایترۆن و هایدروجین)یش دەست پارێزیی ئەکات :

رۆڵەگەم : موسڵمان ئەو پێغەمبـەرە مامۆستا و پەروەردەکەریەتی کە : « لە یەك کاتا خوا پەرسـت و تۆشە گیر و سیاسیی و ، سـەرباز و ، فـەرمـاندە و ، دواندەر و ، پزیشـك و زانایـەکـی ئابووریـی و کۆمەڵایەتیی و ، یاسایی و ، فەلەکی و ، ریاضیی ، مرشد و ، مربـیّ و ، دداوەر و «قاضي» پێشەوا و ، پاشایـەکی گەورە بووە ، ٠٠٠ کـەوابوو دەریای گـەورەیی و زانایی پێغەمبەر ــ صلی الله علیـه وسلم ــ ئەمەندە فراوان و بێ پایانە ئەگەر هـەزاران زانا و فەیلەسووف و هەڵکەوتووی جیهان داوێنی لێ هەڵکەن ئەو پەڕو ئەوپەڕی ناکەن ٠٠ »

جا ــ ئازادگیان ــ گەلێك کە پێغەمبەرێکی ئاوای شارەزا ــ بەهەموو قوژبنێکـی ژیـان چـاودێریکـەری بێت ، چۆن تووشی هـەڵەو نـاڕەوا ئەبێت ٠٠؟!!

**ئازاد :** بابەگیان ٠٠ لەمەوە بۆمباکەی **(هیرۆشیما)** و **(ناگازاکی)** م بیر کەوتەوە کە چۆن بێ بەزەییانە تەقانیان بەرەو گەلی (یابان) ٠٠!!

**باوك :** کوڕە شیرینەکەم مرۆڤ ــ وەك پێم وتی ــ ئەگـەر ترسی خوای لە دڵا نەبێت لە هەموو دڕندەیەك دڕندەتر، چونکە تەنها ترسی خوا سۆز و بەزەیی دروست ئـەکات لـە دڵا سـەبارەت بـە گیانلەبەران ، سەیرکە ئەوانە چونکە لـە خوا بێ خـەبەرن ئاوا ئەکەن لـەو گەلـە ڕەش و ڕووتە :

(٢٠٫٠٠٠٫٠٤٠) بیست ملیۆن و چل کەس ، یا (٢٠٠٫٠١٠) دوو صەد هەزار و دە کەسیان لێکوشتن ، ئیتر بێجگە لە سووتاو و کوێر و شەل و ئیفلیج و شپرز بوو ٠!

**ئازاد :** بابەگیان ·· لەمەوە کەوتە دڵمەوە کـە بڵێم : ئایا رای ئیسلام چییە سەبارەت بەدروستکردنی چەك و هۆیەکانی تری جەنگی··؟ ئایا ڕاستە کـە ئەڵێن : **موسڵمانیـان ووتووە سیواکێك (و بەرماڵێك)** نەك چەك و کەرەسەی جەنگی ، نە ئۆتۆمۆبیل و ، نەفرۆکەو ، نە ·· نە ·· هتد ·· حەزئەکەم تۆزێ ئەمەم بۆ باس بکەیت ·

**باوك :** ئازاد گیان ·· زۆر پاش بوو ئەمەت بیرخستمەوە ، منیش دەمێکە لە خەڵکی ئەبیسم ، وە ماوەیەکە بۆتە گرێی دڵم ·· خوایا لەچ فرسەتێکا تیشکێك بهاوێژمە سەری و تۆزێ شیی بکەمەوە دەی فەرموو قورئانەکەت بکەرەوە با تەماشایەکـی سووردی (الانفال) ئایـەتی «٦٠» بکەین کە ئەفەرمووێ :

**« واعدوا لهم ماستطعتم من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدوّ الله وعدوّكم ، وآخرين من دونهم لاتعلمونهم الله يعلمهم ·· » ·**

تا دەرکەوێ بۆ هەموولایەك کە : ئایا گوناه و تاوانی ئیسلامە و ئیسلام ووتوویەتی : ئێوە هەر ئـەبێ بـەدوای ئەوروپادا بڕوانن ··! دەست نەدەنە چەك ··! بقەیە لیان حە رامە ··! وەیا ئیسلام ووتوویەتی چەك و ئەسڵەحەتان هەر ئەبێ (تیروکەوان) بێت !

ـ چونکە سەرەتای ئیسلام هـەر ئـەوەیان بووە ·· ـ بەڵام بـا خەڵکی‌تر هەموو جۆرە چەکێکیان ببێ و شەوو ڕۆژیش لە داهێنانا بن ··! ئێوەیش ـ موسڵمانەکان :

**« دەست بگرن بە کڵاوە شڕەکەتانەوە با نەیبات » ·**

**ئازاد :** بابەگیان ، بامانای ئایەتەکەمان لـە بیر نەچێتەوە ، دەی فەرموو ماناکەیمان بۆ راڤە بکە ، وا ئێمەیش گوێت بۆ ئەگرین ·

**باوك :** ئازاد گیان ؛ پێش ئەوەی دەست بکەین بەمانای ئایەتەکە ئەمە بزانن کە : ئیسلام بۆ ئاژاوە نانـەوە و پەرتەوازەکردنی کۆمـەڵ نەهاتووە ، نەهاتووە ئەم هۆز بکات بە گژ ئەو هۆزدا ·· ئـەم دەوڵەت

هان بدات لەو دەوڵەتە •• نەخێر ئەمانە ئیشی ئیسلام نین ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئیسلام هاتووە بۆ ئازاد کردنی ئادەمیزاد لە هەموو سووچێکی زەویدا لە دەست ستەمی ستەمکاران و مل هووڕان و دامر کاندنی هێمنی و ئاسایش لە وڵاتدا ، ئاشکرایە لەم پەلامارەدا چەند چین و کۆمەڵێك ئەبنە کۆسپ لە بەردەمیا ، چونکە بە هاتنی ئیسلام گلۆلەی ژیانی سەرەوخوار ئەبێتەوە و ئیتر ناتوانێ بژی و سەرۆکایەتی خۆی لە کیس داوە ، خۆ زۆر دیاریە هەر کۆسپێك هاتە رێی کاروانی بەختیاریی ئەبێ هۆی لابردنی دروست بکرێ بە گوێرەی ئەو رۆژە و ئەو شوێنە و ئەو کۆسپە ، هەروەك پێغەمبەر و هاوەڵەکانی ئامادە بوون بەچەك و ئەسڵەحەی ئەوکاتەی تیا ئەژیان •

ئازاد گیان •• ئەگەر چەکی ئەوکاتە فرۆکە و تانك و ڕۆکێت و مووشەك و •• بوایە بێگومان پێغەمبەری خۆشەویستمان پێکەوەی ئەنا ، کەوابوو پێویستە لەسەر موسڵمانەکان هەوڵ و کۆشش بدەن بۆ فەراهەم هێنانی جۆراو جۆری چەك و کەرەسەی جەنگی بە پێی ئەمڕۆژە •

ئایا چەکی هەزار ساڵ لەمەوبەر بەربەرەکانێی ئەم جۆرە چەکانەی پێ ئەکرێ ••؟! ئاینێك خوای بوونەوەر هەڵی بژاردبێت بە دیاریی بۆ تەواوی جیهان ، ئایا ئەو ئاینە ئەگونجێت ئەوەندە سادە بێت بڵێ :

( فرۆکە و تانك و مانگی دەستکرد قەدەغەیە لێتان وەموسڵمان هەر ئەبێ خاوەنی (سیواکێك) و (تەزبێحێکی) صەد و یەك دەنکی بێت ؟!

**ئازاد :** بابە گیان •• دیارە ئەم باسە زۆر خەست و خۆڵە ، تۆیش لە داخی تێ نەگەیشتنی مەردومدا هەر ئەڕۆیت و مل ئەنێیت ، خەریکە مانای ئایەتەکەمان لە بیر ئەچێت •

**باوك :** رۆڵە شیرینەکەم جا ناهەقمە مێشکم تێك بچێت ، لە ناو کۆمەڵێکدا کە بە ناهەق بێتاوان تاوانبار بکات ، ئازاد گیان •• ئینسان

چۆن دڵی لەت نەبێ لە تاو ئەم وتە بێ جێیانەدا کە ئاراستەی ئیسلام ئەکرێن :

(ئیسلام ناهێڵێ ئێمە فڕۆکە و ڕوکێت و ..هەتەد.. بەدەست بێنین ئیسلام دوای خستوین ..!!) لەکاتێکیشا ئایەتەکەی بەر دەستمان ئەفەرموێ : « ئامادە بکەن بۆیان ـ بۆبێ‌پەیمانان ـ هێز بەپێی دەسەڵان و تواناتان .. » واتە دەستەوسان دامەنیشن و چاوەڕوانی دەستی (قەدەر) مەبن ، ئەو هەرچی کرد هەر وا ئەبێت ..! ڕاستە ئەم بیرە ، بەڵام بڕیاری (قەدەر) وایە ئەبێ بۆ چارەسەری هەمو قۆرت و گرێیەك ئەبێ هەوڵ بدرێ بۆ تەختکردنی ئەو گرێیە ، وە هۆیەکانی بۆ ئامادە بکرێ بەپێی ڕۆژ و کات و شوێن و جێگە لە فڕۆکە و تانك و ڕۆکێت و مووشەك و .. هەتەد ..وە هەروەها.. بێجگە لەمەیش خوای گەورە لە سوورەی (الحدید) ۱ ئایەتی ۲۵ ئەفەرمێ : « لقد أرسلنا رسلنا بالبینات وأنزلنا معهم الکتاب والمیزان ... » .

بەڵێ جا ئەوانەی ڕاڤەی قورئانیان کردووە ئەڵێن : خوا ـ جل جلاله ـ بۆیە دوابەدوای وشەی (کتاب)دا باسی دروستکردنی ئاسنمان بۆ ئەکات ئەمە ئاماژەیە بەوەی کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام پێویستی بە (۳) سێ هێز هەیە بۆ ئەوەی دەوری خۆی ببینێ و لە ناو کۆمەڵا جێگەی بێتەوە :

۱ ـ هێزی یاسا دانان .. القوة التشریعیة .
۲ ـ هێزی دادوەریی ـ القوة القضائیة .
۳ ـ هێزی پیادەکردن ـ القوة التنفیذیة . «ڕاپەڕاندن»

چونکە هەمووی جیهان پەڕاو بێت و پڕ بێت لە یاسای قەشەنگ و ڕێك و پێك ، بەڵام هێزێك نەبێت پیادەی بکات ، دیارە فڕێ ئەدرێتە ڕەفەی لەبیرچوونەوە و باسیشی هەر نامێنێ . کەوابوو ئەمەیش

دیسانەوە داوائەکات لە موسڵمانان کە ئازاو وریاو گورج و گۆڵ بن ، وە بە گوێرەی کات زیواری خۆیان دەست بخەن •

ئازاد گیان ؟ خۆ ئەگــەر تەماشای سیمانامەی پێغەمبەر ـ صلی اللە علیە وسلم ـ بکەین کە چۆن لە رفتاری مەککــەوە رۆیشت بۆ شــاری مەدینە تێمان ئەگەیەنێ کە مەردوم هەمووکات ئەبێ لە هــەوڵ و جم و جوڵا بێت و خۆی نەدات بــەدەست کوفرەوە ، وە ئــەبێ بەربەرەکانێی لەگەڵ بکەیت بەو جۆرەی ئەو هەیەتی ••!!

شتێکی تر هەیە کــە هەموو موسڵمانێك بە چاوی خۆی ئەیبینێ ، ئەویش هەر کەسێك بیری لێ بکاتەوە زۆر بەرێکی لەم مەبــەستە تێ ئەگات ، دواندەر بۆیە لــەرۆژی هەینیدا (شیر) ئــەگرێ بــە دەسیەوە مانای وایە ئەبێ ئیسلام دەستەڵات و هێزێکی بێ ••!

بەڵام ـ بەداخەوە ـ ئەمانە و چەندەهــا شتی ترمــان هــەیە هیچ کەسێك بیر لە فەلسەفەکەی ناکاتەوە ••!!

**ئازاد :** بابە گیان •• هەرچــەند تەماشــا ئەکــەم ئەوانــەی ئــەم تاوانانە ئەدەنە پاڵ ئیسلام فریان بە ئیسلامەوە نیە ، کەوابوو پێویست ناکات تۆ ئەوەندە خۆت بێتاقەت بکەی •

**باوك :** راستە هەق وایە مرۆڤ بە شتێکەوە خەریك بێت بایەخ و نرخێکی هــەبێت ، چونکە ئەوانــەی لــە ئیسلام ئەدوێن •• ئایا گوێ رایــەڵی ئیسلامن ••؟ ئایا رژێم و یاســایان بــە گوێرەی ئیســلامە ••؟ تا هەقی ئەوەیان بێت و بڵێن رێگای ئیسلاممان گرتەبەر و بە ئامانجیش نەگەیشتین !! ئایا جیاوازیی شەقامی وڵاتە ئیسلامیەکان و نائیسلامیەکان چیە ••؟!

ناشێ بڵێی ئەوان بازارەکانیان پڕە لە عەرەق و بیرە و هەموو جۆرە خواردنــەوەیەك و دزیــی و گزیکــاریی و رەش و رووت و تــالان و

برۆو ئافــرەتی ڕووت و قووت و بێ پــەردە و بێ شــەرم و تێکــەڵی لەگەڵ پیاوا •

**ئازاد :** بابە واتای ئایەتەکە بوو بەوە کــە ئیسلام (هێزی) ئەوێ بۆ بــەرگریی لــە هاشاوڵی دوژمنان ، ئیتر بێ دیاریی کردنــی جۆری هێزەکە ، چونکە ئەوە ڕۆژگار دیاریی ئەکات •

**باوك :** ئەی ئازاد گیان •• بۆیە فەرمووی «من قوة» کەواتە ئەبێ موسڵمانەکان خۆیان بەگوێرەی کات و پێویست چەکەمــەنی دروســت بکەن •• هەوڵی بۆ بدەن خۆ کافرەکان لە زکی دایکیانا نەیانهێناوە بۆ ئەوەی بەتەمای ئەم و ئەو نــەبن • پێشینانمان چــەند جوانیان وتووە : « هەرکەس بە تەمای کاســەی دراوسێ بێت •• ئێوارە بێ شێو ســەر ئەنێتەوە • »

کوڕە شیرینەکەم : لەبەر ئەوەی خەریکە تاقیکردنەوەتان دەســت پێ ئەکات •• بڕۆ هــەوڵ و کۆشش بدە و زۆر بــە وردیی موتاڵــەی بەڕاوەکانت بکەرەوە و خۆتی بۆ ئامادە بکە بۆ ئەوەی چاوەڕوانی کەس نەبیت تا نمرەیەکت بۆ زیاد بکات ـ ئینجا پشتیش بەســە بــە خوای گــەورە •

ئەوەیش بزانە ئەم تاقیکردنەوەی قوتابخانەیە تاقیکردنەوەی ڕۆژی دوایشمان بیر ئەخاتەوە ، واتە تێئەگەین وەکو لەم دنیایەدا هەموو کەس ئەبێ بەهەوڵ و کۆششی خۆی دەربچێ لەوێشدا وایە ، وە چۆن ئێرە سەعی ئەوێ ئەوێیش هەر بەو جۆرەیــە •• خوا پــەنا بدات ـ ئازاد گیان ـ لە کەوتن و دەرنەچوونی قیامەت بترسە • کاکە گیان ئیتر لە پەنای خوای گەورە دابژیت و خوات لەگەڵ •

# دیمەنی سێهەم

[ لەو ماوەیەدا کە ئازاد خەریکی ئامادەکردنەوەی نیوەی ساڵ بوو ، باوکیشی سەفەرێکی کرد و گەڕایەوە .. ئازادیش ـ چونکە هەوڵێکی زۆری دابوو نمرەیەکی باشی هێنا و بە سەربەرزییەکەوە هاتەوە و رۆیشتە خزمەتی باوکی و سەلامی لێکرد و ئینجا باوکیشی لە پاداشی زیرەکیی و وریایی ئازادا پەڕاوێکی ژیننامەی (پێغەمبەری) ـ صلی اللە علیه وسلم ـ بۆ هێنابوو دایە دەستی .. ئازادی خەمخۆری ئیسلام بەئەدەب و وێڵێکی تەواوەوە کەوتەوە گفتوگۆ لەگەڵ باوکیدا ] .

**ئازاد :** بابە گیان .. ئایا ئەوانەی کە یەکەمجار شوێنی بانگەکەی پێغەمبەری خۆشەویستمان ـ صلی اللە علیه وسلم ـ کەوتن گەنجبوون یا پیر ..؟

**باوک :** ئازاد گیان ، مەبەستت چییە لەم پرسیارەدا ..؟ رەنگە ئەوەبێ لە دڵتا کە هەندێ چاو بەستراو ئەڵێن [ئایین هی پیر و پەك کەوتەیە ، نەك هی گەنج و لاو ..!!] گوایا ئایین لەگەڵ سروشتی لاوا ناگونجێت ..!!

**ئازاد :** جا بۆ ناهەقمە ئەگەر مەبەستم ئەوەبێت ..؟ ئەوەتە هەر گەنج و لاوە لە شەقام و مەیخانەکاندا مەستە و بێهۆش و گۆش کەوتووە، دوژمنان هۆی رابواردنیان بۆ فراوان کردوون ، ئەوانیش ـ لەبەر ئەوەی کە گەنجیەتی بەشێکە لە سەرکەشیی ـ سەریان تێکردووە ، بە شێوەیەك پرسیارێك خۆی ئەکا بەناواو ئەڵێت : [ئاخۆ لاو قەت بەشداریی ئاینی ئیسلامی کردبێت ..؟!

**باوک :** رۆڵە شیرینەکەم ؛ ئێستا هی‌ی بێکەسییە تا بەو شێوەیە لاوەکان بێ ئەمە ئاگایان لە دنیا بێ ئەسووڕێنەوە ..! ئەگینە لە سەرەتای ئیسلاما و بۆچەند صەدەیەکیش هەر لاوەکان بوون پاسەوانی شەریعەتی خوایان ئەکردو بەدەوروبەری پێغەمبەرا هەڵ ئەسووڕان .

وا بۆ نموونە کۆمەڵێکیان لە خوارەوە ئەنووسین ، تا هەموو کەس بزانێ لاو زیاتر پێویستي بە ئایین هەیە ، بۆ بەرهەڵست وەستانی و گەڕانەوەی لە خراپەکاریی : فەرموو نۆ و ناوی هەندێکیان :

**١ ـ عەلی کوڕی ئەبوو تالیب** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی **(٨)** ساڵ بوو •

ئەم لاوە قوڕەیشییە دلێرە باوەڕی هێناو دوای پێغەمبەری خۆشەویست ـ صلى الله عليه وسلم ـ کەوت و قۆڵی مەردایەتیی لێ هەڵکرد بۆ یارمەتی ئیسلام ، وە تەمەنی لاویی خۆی بەخشیی بە ئیسلام ، وە لە هەموو جەنگێکا بەشداریی کردوە وجێگە دەستی خۆی دیاریی کردووە •

**٢ ـ زوبەیری کوڕی عەوام** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (٨) ساڵ بوو ، ئەم گەنجە لە خواترسە یەکەم کەس بوو شمشێری کێشا لە رێگەی خوادا و کۆچی کرد بۆ (حەبەشە) ، وە لە هەموو جەنگەکانی ئیسلامدا بەشدار بووە •

**٣ ـ طەلحەی کوڕی عوبەیدللا** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی **(١١)** ساڵ بوو • ئەم لاوە خوێن گەرمەیەخاوەنی سەروەت و سامان بوو •• هەر کە هەژارێکی بەدی بکردایە ، وە ئیشێکی خێر پەیدا بوایە گورج خۆشەویسترینی دارایی بۆ سەرف ئەکرد •• بۆیە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ نازناوی **(طلحة الجواد)**ی دایە واتە زۆر سەخی و بەدەهەن •

**٤ ـ ئەرقەمی کوڕی ئەبوئەرقەم** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی **(١٢)** ساڵ بوو •

**٥ ـ عەبدوللای کوڕی مەسعوود** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی **(١٤)** ساڵ بوو •

٦ ـ **سەعیدی کوڕی زەید** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۱۷) ساڵ بوو .

۷ ـ **سەعدی کوڕی ئەبیوەققاص** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۱۷) ساڵ بوو .

۸ ـ **مەسعوودی کوڕی رەبیعە** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۱۷) ساڵ بوو .

۹ ـ **جەعفەری کوڕی ئەبوتالب** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۱۸) ساڵ بوو .

۱۰ ـ **صوهەیبی رۆمی** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۲۰) ساڵ بوو .

۱۱ ـ **زەیدی کوڕی حارثە** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۲۰) ساڵ بوو .

۱۲ ـ **عوسمانی کوڕی عەففان** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۳۰) ساڵ بوو .

۱۳ ـ **طولەیبی کوڕی عومەیر** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۲۰) ساڵ بوو .

١٤ ـ **قودامەی کوڕی مەظعووش** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۲۰) ساڵ بوو .

۱۵ ـ **خەبیابی کوڕی ئەرت** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۲۰) ساڵ بوو .

١٦ ـ **عامیری کوڕی فوهەیرە** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۲۳) ساڵ بوو .

۱۷ ـ **موصعەبی کوڕی عومەیر** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (٢٤) ساڵ بوو .

۱۸ ـ **میقدادی کوڕی ئەسوەد** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (٢٤) ساڵ بوو .

۱۹ ـ **عەبدوڵلای کوڕی جەحش** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۲۵) ساڵ بوو .

٢٠ ـ **عومەری کوڕی خەتتاب** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمـەنی (٢٦) ساڵ بوو • لاوێکـی دڵڕەق بوو •• بێ بەزەیی بوو •• ئیسـلام تینی تێکرد و کۆڕی و کردی بـەو پیاوەی کە ئەگەر مناڵ بگریایە ، ئەویش دەستی ئەکرد بە گریان و ئەیفەرموو « لەوانەیە لەبەر زوڵم و ستەمی عومەر بگری » •

٢١ ـ **ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەڕاح** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (٢٧) ساڵ بوو •

٢٢ ـ **عەمری کوڕی سەعید** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمـەنـی (٢٩) ساڵ بوو •

٢٣ ـ **عوتبەی کوڕی غەزوان** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمـەنـی (٢٧) ساڵ بوو •

٢٤ ـ **ئەبووحوذەیفەی کوڕی عوتبە** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (٢٩) ساڵ بوو •

٢٥ ـ **عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (٣٠) ساڵ بوو •

٢٦ ـ **بیلالی کوڕی ڕەباح** ـ خوا لێـی رازی بێـت ـ تەمـەنـی (٣٠) ساڵ بوو •

٢٧ ـ **خالدی کوڕی سەعید** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمـەنـی (٣٠) ساڵ بوو •

٢٨ ـ **عەیاشی کوڕی ئەبی رەبیعە** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (٣٠) ساڵ بوو •

٢٩ ـ **عامیری کوڕی رەبیعە** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمـەنـی (٣١) ساڵ بوو •

٣٠ ـ **نوعەیمی کوڕی عەبدوللا** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (٣١) ساڵ بوو •

٣١ ـ **عوسمانی کوڕی مەظعوون** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (٣١) ساڵ بوو •

۳۲ ـ **ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەد** ـ خوا لێی رازی بێت ـ (۳۱) ساڵ بوو •

۳۳ ـ **عەمماری کوڕی یاسیر** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۳۵) ساڵ بوو •

۳٤ ـ **ئەبوبەکری صدیق** ـ خوا لێی رازی بێت ـ تەمەنی (۳۷) ساڵ بوو[1] •

ئازیزەکەم :

ئەمانە هەندێ لەو لاوانە بوون هاتنە ژێر ئاڵای ئیسلام لە تەمەنی لاویدا ، کەچی ئیسلام هیچ جۆرە زیانێکی لێ نەدان و بەرگری نەشوو نمای نەکردن •

**ئازاد** : **بابە گیان ٠٠ خوا سۆزی خۆی بڕێژێ بەسەرتا ٠٠ وا** ئەم راستیەت خستە پێش چاو ، تۆپەڵێ قوڕت دا بە دەمی (فرۆیدا) ، چونکە وتوویەتی :

« شەخصیەتی مرۆڤ لەو پێنج ساڵەی سەرەتای تەمەنی منالیەیدا دێت و پێی ئەگات ، دوای ئەو پێنج ساڵە ئیتر پەند و ئامۆژگاریی هیچ سوودێ نابەخشێ ٠٠!! » •

**باوك** : **رۆڵە گیان ٠٠ لەم وتەیەوە پرسیارێك خۆی ئەکا بە** ناواو ئەڵێت : ئایا « دەروونناسی » بناغەیەکی زانیاریی نەگۆڕاوی هەیە ، واتە هەمووکات ئاکامی وەك یەك ئەبێت ٠٠؟

یا فەلسەفەو پێتووڵە و بنچینەیەکی ئەوتۆی بنیە ٠٠؟

**ئازاد** : **بابە گیان قوتابییەکانی** (فرۆید) **وا باس ئەکەن کە** گوایا دەروونناسی چەند بناغە و رێبازێکی زانیاریەو پەیوەندیی بە فەلسەفەوە نیە و هەمووکات یەك جۆر بەرهەم ئەدات •

**باوك** : **جا ئەگەر ئەم وشەیە راستە، ئەی بۆ ئەنجامی تیوورەکانی** لەولاتە سەرمایەدارەکان و وولاتە شیوعیەکاندا وەك یەك نیە ٠٠؟

---

(۱) من هدى النبوة ص۱۱۷ـ۱۱۸ كمال الدين الطائي •

کەوابوو دەروونناسی بریتییە لە چەند بۆچوونێکی فەلسەفی و جل و بەرگی زانیارییان لەبەرکردووە و ناویان نا (علم النفس)، ئەمەیش دوای رووخاندنی دەولەتی فەلسەفە •

**ئازاد :** بابە لەم وتەدا مەبەستت چییە ••؟

**باوک :** رۆڵەکەم •• فرۆید یەکێکە لەو فێڵەسووانەی کە جیهانی خەڵەتاندووە بە ناوی زانیارییەوە •• ئەوەتە لەم لاوە بەرهەڵستیی ئەخلاق و رەوشت ئەکات بەناوی زانیارییەوە •••!! لەو لایشەوە خۆی ئەندامێکە لە نێژنەی دانەرانی «**پرونوتولات حكماء صهيون**»ئە بەهەموو هێزێك ئەیانەوێ پەردەی غیرەت و شەرەف لەبەر مەردوما دامالن بەناوی زانیارییەوە ، بەو نیازەوە پیرو لاو ، پیاوو ئافرەت خەریك بکەن بەڕابواردنەوە و خۆیشیان سواری سەریان بین ••! بۆیە دەم و دەزگای راگەیاندنی رۆژئاواییەکان بێ وچان تیوورەکانی بلاو ئەکەنەوە •

**ئازاد:** بابە ئەمانە چەند قەزیەیەکی شەخصی و خۆیین و پەیوەندییان بەوتە زانیارییەکانەوە نییە •

**باوک :** ئازاد ئەگەر تۆ لە نەخۆشخانەیەك پزیشك بیت ، سەد نەخۆش تاقیکەیتەوە و هەر سەدەیەکەیان تووشی کەمخوێنی (الانيميا ـ فقر الدم)بووبن ئایا ئەتوانی راپۆرتێك بنووسیت و بڵێیت : تەواوی شارەکە تووشی نەخۆشی کەمخوێنی بووە ••؟

**ئازاد :** نەخێر ناتوانم راپۆرتی ئاوا بلاو بکەمەوە ، چونکە ئەم وتەیە تەواو نییە ، ئەی من لە نوێ یەکەیەکەی دانیشتوانی شارەکەم تاقیکردۆتەوە •• تا بۆم رەوان بێت راپۆرتی ئاوا بە جیهانا بلاو بکەمەوە ••؟!

**باوک :** هەموو هەوڵێکی فرۆیدیش لەوە زیاتر نەبووە ، چونکە هەڵسا بە لێکۆڵینەوەیەك بەسەر چەند کەسێکدا کە تووشی نەخۆشی

دەروونیی بووبوون ئینجا لەمەوە یاسایەکی گشتی دانا بۆ هەموو ئادەمیزاد بەتێکڕا ..!!

ئەی بۆ فرۆید بێ وچان خەریکە بۆ ئەوەی دڵی مەردوم سارد بکاتەوە لە ئایین کەچی خۆیشی لەسەر «یەهوودیەت»و بەشداریی کردن لە کۆمەلە ئیمپریالیزمەکان بەردەوامە ..!!

**ئازاد :** بابە گیان ؛ رات چییە سەبارەت بە بیوورەکەی **(فرۆید)** ـ ئەڵێت :

« شەخصیەتی مروف لەو پێنج ساڵەی منالیەیدا پێك دێت ..! بیر چاك بووی نیە .. » ؟

**باوك :** رۆلە گیان .. فرۆید بەجارێ ئەیەوێ خەنجەرە ژەهراویەکەی بێنێتە سەر دلی باوکان و رۆلەکانیان !!

**ئازاد :** چۆن .. بابە ..؟

**باوك :** ئازاد گیان ؛ باوك بەپێی باوو نەریت دوای تەمەنی شەش ساڵی منالەکە ، ئینجا ئەکەوێتە چاودێریی و ئاگاداریی جم و جوولە و هەلس و کەوتی ، چونکە لەپێش ئەم ساڵانەوە چاوی بڕیوەتەوە نەشوونیما و پێکەنین و قسەی خۆش و گەشەی ، واتە تا ئەم تەمەنە هیچ ئامۆژگاریەکی ناکات .. وە هەرکاتیش وەختی هات و باوك ویستی ئامۆژگاریی کورەکەی بکات لە تەمەنی منالیدا فرۆید ـ وەك (مار)سەر لە کوو دێنێتە دەرەوە و ئەڵێت : « تازە لە دەست دەرچووە و هەزار قسە پوولێ ناهێنێ ، چونکە تەمەنی گەیشتۆتە (٦)ساڵ » !!

لەولایشەوە خۆی رووئەکاتە لاوەکان و ـ بەناوی زانیاریەوە ـ پێیان ئەڵێت : ئایین شتێکی پڕو پووچە ..!! سەر کوتکردنی ئارەزووە !! نەخۆشیە دەروونیەکان هۆیان بەستنەوەی (جنسیەتە) ..!

ئایا درۆزن و بێ ئەخلاقی ئاوا ئەگونجێت ببێ بە مامۆستای کۆمەڵ و کۆمەلگە ؟!

ئازاد گیان ؛ ئەو شاگردی شەیتانە وا ئەڵێت ، کەچی پێغەمبەری خۆشەویستمان ـ صلی الله علیه وسلم ـ توانی ئا بەو جۆرە ـ کە خرایە پێش چاوت ـ رووی مێژوو بگۆڕێ ، وە لاپەڕەیەکی نوێ بکاتەوە بۆ لاوەکان کە بێوێنە بێت ، لە دەست پاکی و زمان پاکی و داوێن پاکیدا ، ئەمە لەکوێ و وێنە پووچەڵەکەی نرۆێدی فریودەری جیهان لەکوێ ..؟ « دوای (٦)ساڵ هەرچی بکوترێ بەم منداڵ هیچ کەڵکێکی نیە ..! » چونکە هەر کامێکیان بگریت لەو دلێرانەی ئیسلام تەمەنی لە (٦)ساڵ بەرەو ژوورترە ، بۆ سلووکیان گۆڕاو لەو دڵ ڕەقیی و بێسۆزیی و بێ بەزەییەوە بوون بەو پیاوانەی کە هەموو جیهان ـ بەتایبەت لە سەدەی بیستەمدا ـ خەویان پێوە ئەبینێ ..!!

کەوابوو ئەم تاقیکردنەوە و بەراوردەی پێغەمبەرە ـ صلی الله علیه وسلم ـ بۆ پێگەیاندنی ئەو پیاوانە لە هەزارەها تیۆور و بیردۆز راسترە .

**ئازاد :** من بەش بەحاڵی خۆم تا ئێستا نەمزانیوە کە کۆمەڵێکی لاوی خوێن گەرمی ئاوای خواناس لە دەوری پێغەمبەرا ـ صلی الله علیه وسلم ـ پاسەوانی ئیسلام بوون ..!!

**باوك :** ئازاد گیان ؛ منیش ناهەقت ناگرم ، چونکە لە ئێستای کۆمەڵەوە تەماشای ئەوکاتەیش ئەکرێ .. ئێستا ئەبینرێ ئەوانەی هاتوچۆی مزگەوت ئەکەن بریتین لە چەند پیاوێکی پیری پەککەوتە ، ئەوانیش وشك ، بێ تاقەت ، کەس ناوێرێ نزیکیان بکەوێتەوە ..!! ئەمە لە لایەکەوە ، لەلایەکی تریشەوە لاوەکان ـ زۆربەیان ـ کەلەمچەی هەواو ئارەزوون ، وە لە سەدان لاوە بۆیان دانیشتوون ، ئەمانیش بەکوێرانە ئەنیشنە ملیان ، خۆ ئەگەر خاوەن سۆزێك هەڵکەوێ دەستیان بۆ رابکێشێ .. سەد هەزار پیلانی بۆ ئەدۆزرێتەوە و

بەدەیان ناوو ناتۆرەی پێوە ئەنرێ و بە پیاوی بێگانە ئەدرێتە قەڵەم ، وەیا ئەڵێن « شتێکی وا لەژێرسەرا !! » •

**ئازاد :** بابە گیان •• فەرموودەکەت زۆر راستە ، بەڵام چۆن و بەچ شێوەیەك لە سەدان لاوە بۆ لاوەکان دانیشتوون ؟!

**باوك :** ئەو پروپاکەندانەی کە (سەهیۆنیزم) و (ئیمپریالیزم)ەکان نەخشەیان بۆ کێشاوە بۆ لاوازکردن و مراندنی دەماری غیرەت و شەرەف لە هەموو جیهاندا بەگشتی ، وە سەبارەت بــە ئیسلام بــە تایبەتی ••! هەرکەسێ تۆزێ ئاگاداری ئەو پیلانانە بێت کە دەست نیشانیان کردوون زۆر بەروونیی ئەیسەلمێنێ کە خاڵی سەرەکیان سڕینەوەی خووڕەووشتی پیاوانەیە لەناو کۆمەڵدا بەم شتانەی لای خوارەوە •

یەکەم : نیشاندانی فلیمی سینەمــایــە ، بــەجۆرێك مرۆڤ شــەرم ئەکات بەزمان بیڵێت ، وەهاندانی ئەو نافرەتانەیە کــە بــەکرێ گیراوی ئەوانن ، بۆ ئەوەی کە خۆیان نیشان بدەن بــەرووت و قووتی لەبــەردەم هەزارەها لاوی تازە پێگەیشتووی خوێن گەرما !!

ئازاد گیان •• زۆر بەداخەوە بۆ ئــەو باوك و دایکانە و ئــەوانەی پەروەردە و لەلــەی منالیان بــە ئەستۆوەیە ــ هەروەك منالەکان ســادە و نەفامن ، ئەمانیش وەك ئەوان چاو ئەبڕنە ئەو جۆرە فیلیمانە و پتر لەوان هەوڵەق ئەبن ••!!

وە هەروەها زۆر شوورەیی‌یە بۆ ئەو باوك و دایکەی کە شێوەی دڵداریی و مــاچ و مۆچ و •• هــەتەد •• لەبــەرچاوی کچ و کوڕە پێگەیشتووەکانیا پیشان بدات •

بەڵێ •• دوژمنانی خووڕەوشت و شەرەف و کەرامەت بەمە تێر نەبوون ، ئیتر دەست بکێشنە دواوە •• بــەڵکو هەوڵێکی زۆریان دا بۆ ژێر دەستکردنی ئــەو فابریقە و کۆمپانیانەی کــە فیلــم دەرئەکــەن بۆ

سینەماکان ، وەپارەیەکی زۆریان پێدان بۆ ئەوەی کارەکەیان چڕوپڕتربێت و داوەکەیان باشتر بچێنن ..!!

ئازاد گیان ! بۆ درۆ و راستیی من ، چاوێ بگێڕە بەو وێنانەدا کە بەدیواری دەرگای سینەماکانا هەڵواسراون ، بزانە پێی بڵێیت «پەردە»لەبەر ئافرەتا هێشتوویانە ئەمە و زیانی لەمە ، هەربۆئەوەیە کە ئێوەی پێوە خەریك بن و ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان گەزی بکەن و کەسێك ئاگادار نەبێت و دزیان هەڵسێ ..!!

**ئازاد : بابە گیان .. راستە من وەك لاوێك ئەزانم فیلم چەند** ئاریکەرە لەدەروونا فیلمی رووت و قووت ئادەمیزادی کوشت و رۆح و مانای ژیانی ئازادیی نەهێشت چونکە رێگەی دەستدرێژیی و بێ نامووسیی و دزیی و گزیکاریی نیشانی کۆمەڵ ئەدات ، ئارەزوو وشەهوانیەتیان بەرەڵلا ئەکات ، ئیتر تێکەڵ بوونی نێر و مێ ، پیاوو ئافرەت لەدەرگا و ژوورەوەی سینەماکانا با بووە ستێ ( خوا پەنامان بدات ) .

بەتایبەت لەمکانەدا کە ترسی ئابڕوچوونی پاشەڕۆژی نەماوە ، چونکە بەدەیان فرۆفێڵ داهێنراوە بۆ بەربەستکردنی زاوزێ ..!

بەڵام بابە گیان حەز ئەکەم درێژە بەم باسە بدەیت بۆ ئەوەی ئەو شتانەی هۆی تێکدانی مێشکی لاوەکانن بیان ناسین .

**باوك : هۆی دووەم بۆ تێکدانی لاوەکان گۆرانی بێژەکانن** بە شێوەیەك زۆر زۆر دوور لە یاسای خووڕەوشتەوە ، رۆڵەکەم ! ئەوی بیبینێ ، یا بیبیسێ ئەزانێ ـ ئەگەر بەو پێیە بڕوات ـ رۆژێکی رەش چاوەروان ئەکرێت !!

هۆی سێهەم : چیرۆك گێڕەکانن .. چونکە ئەوانیش هەریەکەیان بەسەدان شتی بێبناغە و پووچەڵ و بێ ناوەرۆك ئەڵێت لەسەر شانۆکان ،

وەبــە هــەزارەهــا درۆ و پڕ و پالاتــەی پێوەئــەنێت ، وەبــە زمــانــی حال ئەلێت :

( خەلکینە ئێوەش درۆبکەن ، چونکە درۆ سەرچاوەی ژیانە ئەوە نیە من بەخششی لەسەر وەر ئەگرم ) ..!!

**هۆی چوارەم** : بەرنامەکانی (تەلەفزیونە) .

پێنجەم : ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەیە کە بە سەدەها وێنەی ڕووت و قووتی ئافرەتەکانی ئەوروپا نیشان ئەدەن .

**ئازاد** : بابەگیان ؛ راستییەکەی لاو نازانێ رووبکاتە کوێ ،چونکە بەهەر لایەکا ئەڕوات ، یا ئافرەتی بێڕێزە ، یا گۆڤاری بێ ئابڕوویە ، یاسینەمایە ، ئەمەهەر لەبازاڕەکاندا ، خۆ ئێوارەیش لە مالەوە سەدهەزار خۆزگە بە بازاڕەکان ، چونکــە لەوێ ئــەیتوانی خۆی لابدات بەهــەر شێوەیەك ببوایە ، بەلام مالەکە پڕە لە جۆرا و جۆری بێ شەرعی ..!!

**باوك** : ئەی ئازاد گیان .. وایان کردووە بەولاتــە موسلمانەکان کە ئەڕۆیتە بازارەوە نازانی بازاڕی پاریسە ، یا هیی شارە موسلمانەکەی خۆتە !!

**ئازاد** : بابە گیان : ئێستا وەك خۆت ئەزانی سینەما و تەلەفزیون کراوە بە نیشانەی پێشکەوتن ـ لای گەلی سادە ـ ئایا رای ئیسلام چییە بەرامبەریان ؟

**باوك** : رۆلەکەم ؛ سینەمــا و تــەلــەفزیون و رادیوو وەیــا هــەر ئامێرێکی تر ئەمانــە لــەخۆیاندا بریتین لەچوارچێوەیــەك هیچ تاوانێکیان نیە ، بەلکو تاوان و ناپاکی هیی ئەوانەیە کە شتی ناشیرین و ناپەسەندی پێ نیشان ئەدەن ، یان ئەلێن .

**ئازاد** : بابە گیان .. بەرای ئیسلام چی نیشان بدرێ لــە فیلمی سینەما و تەلەفزیون دا ..؟

**باوك** : رۆلەگیان پێشەکی بزانە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەرشتێك مایەی پێشکەوتن و فێرکردن بێت بــە پیرۆزی دائەنێت .. ئاشکرایشە

سینەما و تەلەفزیۆن باشترین هۆن بۆ پێگەیاندن و پێگەیاندن و فێرکردن •

جا چ شتێك لەوە باشتر بێت کە هەموو ماڵێك ببێ بە قوتابخانە و فێرگە و سەربازگە و جێی پیشەسازیی ، بێ هیچ ئازار و ماندووبوونێ •

ئازاد گیان ! بۆ لەباتی فیلمی رووت و بێ ئابڕوویی و بێ شەرمیی و تێکدەری مێشکی لاوان و نیشاندانی ئافرەت بە رووتی لە گۆمی مەلەو تیاترۆکاندا •• بۆ لەباتی ئەمانە مافی ئافرەت و هۆی پێشخستنی نیشان نەدرێ ••؟ بۆ ئەو شتانە نیشان نەدرێ کە ئافرەت پێویستی پێیان هەیە چ ئایینی و چ دنیایی ، چ لە ماڵەوە و چ لە دەرەوە ••؟ بۆ ئەوەی نیشان نەدرێ کە چۆن کۆرپەکان پەروەردە بکات بۆپاشەڕۆژ ••؟ بۆ ئەوەی نیشان نەدرێ کە چۆن تەون و دروومان بکات و بەرگ و پۆشاك دروست بکات بۆ منداڵەکان ••• هتد ••؟

**ئازاد :** هەروەك فیلمی رووت نیشان نەدات ، لەگەڵ ئەوەیشا پیشەسازیی و هەمووجۆرە پێویستیەکی ژیانیش پێشکەش ئەکات •

**باوك :** رۆڵە گیان •• ئەمە وەك ئەوەوایە کەسێك هەنگوینت بداتێ و ئینجا پەرداخێ ژەهریش بکات بەسەریا •• ئایا هەرچی لەش و دەمار و دەروونت هەیە نا یمرێنێ ••؟

و ئافرەتەکە فێری دروومان و پیشەسازیی بکات •• لەولایشەوە فێری بەرەڵلایی و سەما و سووڕدانی بکات ، وەمل بەکەس نەدات و کەسیش نەوێرێ بڵێ ئەوە چی ئەکەیت ••؟! گەورە و بچووکیی لانەمێنێ و رێزی باوك و دایکی بەلاوە نەبێت ••!! چ کەڵکێکی هەیە کوڕەکە فێری نووسین و خوێندنەوە بکات •• لەولایشەوە فێری جەردەیی و ماڵ برین و بانق برینی بکات ، وە هەروەها فێری ئەوین و عەشق بازیی بکات ••؟!

ئازاد گیان ؛ ئەوا بانگی فـەرموو ، بانگمان ئـەکا بۆ لای خوای پەروەردگاری بوونەوەر بۆ تازەکردنەوەی پەیمانی راستی و هەوڵ و تێکوشان و فیداکاریی و قوربانی دان •

بۆ دەمەزەردکردنەوەی باوەڕ •• فەرموو با بچین بۆ مزگەوت •• هەردووکیان هەڵئەستن و ئەڵێن :

**سبحان ربك رب العزة عما يصفون**

**و**

**سلام على المرسلين**

**و**

**الحمد لله رب العـالمين**

# دیمەنی چوارەم

[ دوای حەوانەوە لـە ئیش و کاری رۆژانـە و نوێژی شـێوان ٠٠ قوتابیەکی موسڵمان ، دەرچووی شـەشی ئامادەیی پیشەسازیی ـبەناوی ـ(ئومێد)ـە لە دەرگا ئەداو داوای ماوە ئەکات بێتەژوورەوە ٠٠ بەڵێ هاتە ژوورەوە و سەلامی کردو ئینجا رووی کردە ماموستا ٠٠ ]

**ئومێد :** ماموستا بیروڕای ئیسلام چییە سەبارەت بە بەجێ هێنانی ئارەزووی «جنسیی» ؟

**ماموستا :** کاکـە ئومێد ؛ پرسیارەکـەت زۆر بـەجێیـە ، وەزۆر بەکەڵکە ، چونکە زۆرکەس وائـەزانێ موسڵمان تەنهـا ئـەبێ خزمەتی رۆحی بکات ، ئیتر خزمـەتی لاشەو بەجێ هێنـانی ئارەزووی جنسییەت لە ئیسلاما نیە ٠٠!

جا وا بە پشتیوانی خوای گەورە تیشکێك ئەهاوێژمە سـەر ئـەم باسەیـە تا رۆشن بێتەوە بۆ هـەموولایـەك کـە ئایینی پیرۆزی ئیسـلام چەندە گرنگیی بەم باسە داوە ٠٠، وەتا هەمووکەس بزانێت کە ئیسلام دوورە لە گۆشەگیریی و دەست بەرداربوون لـە دنیـا ، وەك پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەفەرمێ :

« خوا لـە باتی ئاینـی گۆشـەگیریی و ملکزکردن ئاینێکی پڕ سۆز و خاوەن میهرەبانی بۆ هێناوین » ٠

« ان الله أبدلنـا بالرهبانیـة ٠٠ الحنیفـة السمحة » بەیهـەقی ٠ دیسانەوە هەڕەشە ئەکات لەو کەسانە کە خاوەن دارایین و دەست لـەم شتەزگماکی و سروشتیە هەڵئەگرن ، بەشێوەیەك لە کۆمەڵی موسڵمانانی دوور ئەخاتـەوە « من کان موسراً لأن ینکح ثـم لـم ینکح فلیس منی » طەبەرانیوبەیهەقی ٠ کاکە ئومێد ! لەم فەرموودانە و چەندان فەرموودەی ترەوە رۆشن ئەبێتەوە کە ئاینی پیرۆزی ئیسـلام چۆن یاساغی ئـەکات

دەست کێشانەوە و واز هێنان لە (جنسیەت) بەتایبەت لەکاتی دەسەڵات و بێ بیانوویدا •

دیسانەوە ئەگەر تۆزێ تێ بفکرێین لـە هـەڵوێستەکانی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ سەبارەت بـە چارەسەرکردنی هێزە زگماکی و دەروونیەکانی ئادەمیزاد بڕوامان پتەوتر ئەبێت بەئیسلام ، چونکـە زۆر بە وردیی و زۆر بەقوولیی وەڵامی داخوازیە دەروونیەکانی داوەتەوە، بەڵکو ئەگەر بـە شێوەی پێویست نەهێنرێتە بـەرهەم سزاو تۆڵەی بۆ دانراوە ••!! چونکە ئەم جیهانە بەزاوزێ ئاوەدان ئەبێتەوە ، لەولایشەوە یاسایەکی خواییە هەرکەس پشت گوێی بخات چـەندەها گیروگرفت دێتە بەردەمیی ، وەتووشی زیانی لاشـەیی و دەرونیی ئـەبێت ، چونکە مانەوەی ئەو (ئاوە) لە تەنی مرۆڤدا هۆی زیانە بۆ لـەش و دەروون ، هەروەك بنەبڕ ئەبێت و بە وەجاخ کوێریی سەر ئەنێتەوە ••

**« فطرة الله التي فطر الناس عليهـا لاتبديل لخلق الله ، ذلك الدين القيم ، ولكن أكثر الناس لايعلمون » الروم/ ٣٠ •**

**ئومێد :** مامۆستا ؛ ئەی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ لـەم بارەیەوە هەڵس و کەوتی چۆن بووە ••؟

**مامۆستا :** کاکـە ئومێد ؛ پێغەمبـەر ـ صـلی الله علیـه وسـلم وەنەبێت دەستی لـە دنیـا هەڵگرتبێ وە وەڵامی داخوازیـەکانی لـەشی نەدابێتەوە ، واتە تەواویی ساڵ بەرۆژو بووبێت ، خـەوو خۆراکی لـە خۆی یاساغ کردبێ ، دەستی لەژن هێنان هەڵگرتبێ •

نەخێر پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ زۆر بەرێك و پێکی هەموو فەرمانەکانی لەشی جێبەجێ کردووە •

تەنانـەت ئەفـەرمێ : ئـەو کـەسـەی ژن نـەهێنـێ لـە ئیسـلام دەرئەچێت(١) •••!! دیسانەوە پێغەمبەرمان ـ صلی الله علیـه وسلم ـ

---

(١) بۆ ئەم باسە باخوێنەر سەرێك لە کتێبی (سەربەستیی لە ئیسلامدا) بدات •

چەندەها خێزانی بوون ، ئەمەیش ئەوەمان تێ ئەگەیەنێ کە رۆژێ لە رۆژان سەرکوتی (جنسیەتی) نەکردووە[٢] •

**ئومێد :** مامۆستا ؛ دوای ئەو هەموو فەرموودانەی پێغەمبەرە ـ صلی اللّه علیه وسلم ـ لە بارەی داخوازیەکانی لەشەوە بۆچ ئیسلام تاوانبار ئەکەن و ئەڵێن : هێزی جنسیەتی مەردومی سەرکوت کردووە ••؟!

**مامۆستا :** کاکە ئومێد •• ئیسلام بەربەست و پەنگی جنسیەتی نەداوەتەوە ـ وەك دوژمنان ئەڵێن ـ بەڵکو ئەوەی ئەوان پێی ئەڵێن (کبت) ، لە راستیدا (ضبط ـ)ە ، چونکە ئیسلام یاسای زۆر قەشەنگی داناوە بۆ جێبەجێ کردنی ئارەزووی لاشەیی ، وە هەروەها شوێن و رێگەی بۆ دەست نیشان کردووە ، بەڵام ئەوەندە هەیە مرۆڤ بەرگریی ئەکات لەوەی کە جیاوازیی لە نێوان هیچ ئافرەتێك نەخات ، واتە تکە و بەرانی و بێسنوور ، وە بەسەر شەرەفی ئەم و ئەوەوە رابوێرێ ••!! ئەمەیە تێ نەگەیشتووەکان پێی ئەڵێن (کبت) ••!! دە ئەگەر تەنها چاوت لەخێزانەکەی خۆتەوە بێت و رێزی شەرەفی مەردوم بگری ئایا ئەمە کەبتە ••؟!

دیارە (میکرۆب) بەهەر شێوەیەك ئازاری خەڵکی بدات و لەسەر دڵی ئادەمیزادا بلەوەرێ هەر خۆی بە تاوانبار نازانێ و نزای شەرپیش ئەکات لەو کەسەی دژی بۆ دۆزیوەتەوە ••!

کاکە ئومێد ! تەنانەت ئیسلام ئەفەرمێ •• « پێویستە چوار شەو جارێك بچێتە لای هاوسەرەکەی » واتە بەرنامەی خوا یاسای چوونەلای ئافرەتیشی داناوە ، چونکە ـ وەك پزیشکەکان ئەڵێن ـ هێشتنەوەی ئەو ئاوە زیان بەخشە بە لەش •

---

(٢) واتە کەبتکردنی بەکار نەهێناوە •

ئیسلامی پیرۆز تا ئـەو ئەندازە رۆیشتووە کـە بەبێ پەردە باسی (دەورەی جماع)ئەکات و ئەفەرموێت : هەموو شتێك ئەبێ (ئیقتیصاد)ی تیا بکرێ ••!! ئیتر ئێمە چی بکەین لە ئادەمیزادی نەفام •• هیچ نەزان •• تێنەگەیشتوو وەك فرۆیدی هەڵگری ئاڵای بێشەرمی و بێ شەرەفی••!!؟ چی بکەین لەو مرۆڤەی (خۆر) نابینێ ••؟!

**ئومێد : مامۆستا ؛ بە ئـەرکی مەزانـە تۆزێ سـوود و کـەڵکی** یەککەوتنی ژن و پیاومان بۆ باس بکە ••

**مامۆستا :** کاکە ئومێد ، ژن هێنـان و یەککـەوتنـی نێر و مـێ واتە پیاوو ئافرەت بـە شێوەیەکی پەسـەندی شەریعـەتی ئیسلام شتێکی زگماکی و چار نەکراوە و ئەبێ هەر بێت لەبەر چەندەها هۆ ، ئەمانەیش هەندێکیانن :

١ ـ بۆ مانەوەی جۆری توخمی ئادەمیزاد ، چونکە بەجووت بوونی نێر و مێ جۆری ئادەمیزاد زۆر ئـەبێ و یـەك بـەدوای یەکدا دێت ، بەردەوام ئـەبێت و پەرەئـەسێنێ ، ئاماژە بـەم مەبەستەیە قورئانی پیرۆز ئەفەرمێت :

**« والله جعل لكم من أنفسكم ازواجاً وجعل لـكم من أزواجكم بنين وحفدة •• » النحل/٧٢ •**

٢ ـ بۆ مانەوەی رەگەز و نەژادە ، چونکـە هەرکـەسێك خاوەن هەست بێت ئەزانێ خۆشی و کامەرانیی و بەختیاریی ئەم جیهانە لە پاڵی کـەس و کارایە ، بـە تایبـەت باوك و دایك و برا و خوشك ، بۆیـە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرموێ :

**« تناكحوا ، تناسلوا » •**

٣ ـ بۆ ئەوەی کۆمەڵ بە داوێن پاکی بژی ، چونکـە ئارەزووی سێکسیەت ئەگەر لەرێگەی پاکی دیاری کراوی خۆیەوە جێبەجێ نەکرێ

سووکیەتیی و نەنگ و شەرواڵ پیسیی تووشی ئەو کۆمەڵە ئەبێت ..!! ڕووبەڕووی ئـەم مەبەستەیە پێغەمبەرمان ـ موحەممەد صلی الله علیـه وسلم ـ ئەفەرمێ :

**« یا معشر الشباب من استطاع منكـم الباءة فليتزوج ، فانه اغض للبصر واحصن للفرج .. فمن لم يستطع فعليه بالصوم فانه له وجاء.. ».**
جەماعەت گێڕاویانەتەوە .

٤ ـ بۆ ڕاگیرکردنی تەندروستیی ولەش ساغیی یە لە نە خۆشیەکانی ناو کۆمەڵ .. چونکـە بەهۆی یەککەوتنی ئافرەت و پیاوەوە کۆمـەڵ ئەپارێزرێ لەو نەخۆشیانەی لەزینا و شەرواڵ پیسییەوە پەیدائەبن ، وەك نەخۆشی سووزەنەك و ئەو نەخۆشینانەی ئەبنە هۆی بنەبڕی زاوزێ .

٥ ـ بۆ ئاسایش و حەسانەوەی گیان و دەروونە ، چونکە پیاو کاتێ لە ئیشەکەی دەست هەڵئەگرێ و بـەرە وماڵەوە ڕێگە ئـەگرێتە بەرو لەگەڵ خاوخێزاندا کۆ ئەبێتەوە ، گومانی تێدا نییە کـە ئەحـەسێتەوە و ماندووبوونی لە بیر ئەچێتەوە .

ئافرەتیش کاتێ لەگەڵ مێردەکەیدا کۆئەبێتەوە و بە یەکەوە ڕاز و نیازی دڵیـان شی ئەکـەنەوە ماندووبوون و ئـەرکی ڕۆژانـەی لـە بیر ئەچێتەوە هەروەك قورئانی پیرۆز ئەفەرمێ :

**« ومن آياته ان خلق لكم من انفسكم ازواجاً لتسكنوا اليها وجعل بينكم مودةً ورحمة إن في ذلك لآيات لقوم يتفكرون » الروم/ ٢١ .**

٦ ـ پیاوو ئافرەت بە هەرەوەزی خێزان دروست ئەکەن و پەروەردەی منداڵ ئەکەن ـ بێگومان بـە هۆی نیکاحـەوە ئـەم دوانە ـ ژن و پیاو ـ یارمەتی یەکتر ئەدەن لەسەر دروست بوون و پێکهێنانی خێزان .

ئافرەتەکە ئیش ئەکا بەپێی توانینی خۆی و ئەوەی لەگەڵ سروشتی (أنوثە)تیا بگونجێت .. وەك چاودێری و هەڵسووڕاندنی کاروباری ناو ماڵ و پەروەردەی مناڵ .

ئافەرینم بۆ ئەو شاعیرەی کە چەندجوان باسی دەوری دایك ئەکات بۆ پەروەردەی مناڵ و پێگەیاندنی گەلێکی تێگەیشتووی ڕەووشت بەرز کە ئەڵێت :

الأم مدرسة اذا أعددتها أعددت شعباً طيّب الأعراق

وە هەروەها پیاوەکەیش بەپێی لەیاقەت و لێهاتوویی خۆی هەوڵ ئەدات بۆ پەیداکردنی ڕۆزیی بۆیان و پاراستنیان لەوکارە ناهەموارانەی دێنە بەردەم ژیانی خێزان .

ئینجا بەم هۆیەوە سۆز و بەزەیی ئەکەوێتە دڵی باوك و دایکەوە بەرامبەر بەهەموو گیانلەبەرێکی تر ، بێگومانم هەر گەلێك خاوەنی سۆز و بەزەیی بێ ، دوور ئەبێت لە گزیی و ستەم و خواردنی ماڵی یەکتر و ڕەش و رووت کردن و .. هتد .

کەوابوو جێگەی خۆیەتی ئاینی ئیسلام ئەوەندە بایەخ و گرنگیی داوە بە مەسەلەی ژن هێنان .. چەند فەرموودەیەکی پایە بەرزە ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە ـ صلى الله عليه وسلم ـ کە ئەفەرمێ :

« هەموو بوونەوەر ـ بێجگە لە خواناسین ـ ناگاتە پلەی ئافرەتێکی چاکی گوێ ڕایەڵی مێردەکەی و رووخۆش و دەست پاك و داوێن پاك :

**« ما استفاد المرء بعد تقوى الله ـ عز وجل ـ خيرا له من زوجة صالحة ان امرها اطاعته ، وان نظر اليها سرّته ، وان اقسم عليها ابرته ، وان غاب عنها نصحته في نفسها وماله » . ئیبن ماجە گیراویەتەوە .**

**ئومێد : مامۆستا گیان ؛** خوا یارمەتی دەرت بێ ئەمانە هەندێ کەڵك و سوودی ژن هێنان بوون ، باشە ئەو ئافرەتەی کە لە ئەنجاما ئەبێ بە دایکی منالّ تاریقێکی بکە لەسەر زمانی ئیسلام .. یا لە ئاکامدا تووشی هەڵە نەبین وەتابزانین چ جۆرە ئافرەتێك پەسەندە لای ئیسلام ..؟

**مامۆستا : کاکە ئومێد ؛** بۆ ئەم دروست بوون و یەککەوتنی ژن و مێردی‌یە شەریعەتی ئیسلام یاسای تایبەتی و بناغەیەکی پتەوو بەهێزی داڕشتووە ، تا لە پاشەڕۆژا پەشیمانی نەکەوێتە نێوانیانەوە و یاسای ژن و مێردیان لێ تێك نەچێ ، لە ئەنجامیشا بێتە هۆی تەفرەقە و شڵەژاندنی منالەکانیان ، ئەوانیش بێ لەلەو بێ دالّدە سەرگەردان بسووڕێنەوە !.

جا وا بۆ هەڵبژاردنی ئافرەت بۆ پیاو ، وەیا پیاو بۆ ئافرەت ئەم چەند خالّە ئەخەمە پێش چاوت :

١ ـ هەڵبژاردن لەسەر بناغەی ئایین .

مەبەست بەم ئاینە تێگەیشتنە بەرێك و پێکی لە ئاینی ئیسلام و وپیادەکردنی یاساکانی ئیسلامە لە هەموو هەڵس و دانیشتن و جم و جوولێکی ڕۆژانەیدا ، کاکە ئومێد ؛ هەرکات **(خوازبێنی‌کەر)** وەیا **(خوازبێنی‌کراو)** بەم پێیە تێگەیش لە ئیسلام ئەوە رەوایە پێیان بگوترێ خاوەن ئایین ، وەجێگەی خۆیەتی بەدوای یەکترا بگەڕێن . زۆر جێگەی خۆیەتی کە شەریعەت ئیسلام بەو جۆرە پیاوە ئەڵێت : **(الزوج المحمود)**وە بەو جۆرە ئافرەتەش ئەڵێت « **الزوجة المحمودة** » ـ خۆ ئەگەر هات و بەوپێیە نەبوون ، واتە بێ ئایین و دوور لە ئیسلام بوون ، ئەوە نابێ هیچ لایەکیان مل بدەن بە یەکتر ، چونکە ئەگەر پیاوەکە خاوەن ئایین و خووڕەوشت بێ ، بەلام ئافرەتەکە بێ ئایین بێت ، ئەوا لە نیوەی ڕێگەدا کاروانەکەیان پەکی ئەکەوێ و ئینجا تەنها ڕێگە بۆ چارەسەریان جیابوونەوە و تەلاقدانە ..!

خۆ ئەگەر ئافرەتەکە ملکەچی فەرمانەکانی ئیسلام بوو ..
پیاوەکە گوێی بە ئیسلام نەئەدا ، ئەوە دیسانەوە پشێویی و ئاژاوە دروست ئەبێتەوە ، بۆیە پێغەمبەرمان ــ صلى الله عليه وسلم ــ ئەفەرمێ :

**« تنكح المرأة لأربع : لمالها ، ولحسبها ، ولجمالها ، ولدينها فاظفر بذات الدين تربت يداك .. »** بوخاری وموسلیم .

واتە ئەگەر یەکێ ویستی هاوسەرێك پێکەوە بنێت ، هەق وایە تەنها ئاینداروییی و خواپەرستی پێش چاو بکرێ ، چونکە بەرگ و کالآی شەرەف و غیرەت و تاجی سەری ئافرەت تەنها خووڕەوشتی پەسەندە ، نەبنەماڵە ، نە نەژاد ، نە سامان ، نە جوانی .. نە پلە و پایە .. نە بڕوانامە و نە شەهادە ، هێما و ئاماژە بەم مەبەستەیە ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە ــ صلى الله عليه وسلم ــ :

**« من تزوج امرأة لعزها لم يزده الله إلا ذلاً ، ومن تزوجها لمالها لم يزده إلا فقراً ، ومن تزوجها لحسبها لم يزده الا دناءة ، ومن تزوج امرأة لم يرد بها الا أن يغض بصره ، ويحصن فرجه ، أو يصل رحمه بارك الله له فيها وبارك لها فيه .. »** . طبرانی گێڕاویەتەوە .

**ئومێد :** مامۆستا ؛ ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەك ئەوەندە لەگەڵ پیاوا هەوڵ ئەدات و گفت و گۆی لەگەڵ ئەکات ، ئایا سەبارەت بە ئافرەت چ رایەك دائەنێت ؟

واتە ئەم چۆن مێرد بکات و کێ هەڵبژێرێ بۆ هاوسەری خۆی..؟

**مامۆستا :** کاکە ئومێد ؛ پێغەمبەر ــ صلى الله عليه وسلم ــ هەرووەك نەخشە ئەکێشێ بۆ دۆزینەوەی ئافرەتێکی بەخووڕەوشت ، هەر بەو جۆرەیش داوا ئەکات لەئافرەتەکە و کاربەدەستی ئافرەتەکە هەوڵ بدەن پیاوێکی موسڵمان و دەم و دەست و داوێن پاك بدۆزنەوە بۆیە ئەفەرمێ :

**« اذا جاءكم من ترضون خلقـه ودينه فزوّجوه ، إلا تفعلوه تكن فتنة في الأرض وفساد عريض ٠٠ »** ٠ ترمذی هێناویەتی ٠

بەڵکو ئەبێ پتر هەوڵ بدرێت بۆ دۆزینەوەی هاوسەرێکی رێك و پاك بۆ ئافرەت ، چونکە ئافرەت ـ ئەگەر هاوسەرەکـەی نارێك بوو ـ بەگران رزگاری ئەبێت لە دەستی ٠

کاکە ئومێد ! موسڵمانانی پێشوو وشـە بـە وشە ، رستە بـە رستە بەرنامەکانی ئیسلامیان پیادە ئەکرد لە هەموو رووپەکەوە ٠٠ هەر لە پێغەمبەر و هاوەڵەکانیـەوە تا دێرین رۆژگار ٠٠ ئەوەتـە خۆی بەزمانی خۆی ئەفەرمێت من ژن ئەدەم بە (عوسمان) ـ خوا لێی رازی بێ ـ ، وە هەروەها عومەری کوڕی خەتتاب داوا ئەکات لە (ئەبوبەکر و عوسمان) خوا لێیان رازی بێت ـ بۆ ئەوەی ژنیان بداتێ !!

**ناشێ سەرگوزەشتەکەی (سەعیدی[1] کوڕی موسەیب) و کچەکەیت** لەبیر چووبێتەوە و نەتیبستبێ ٠٠؟

**ئومێد :** ماموستا ، ئێمەی قوتابی چیمان بیستووە ٠٠؟ فەرموو بە ئەرکی مەزانە بۆمان باس بکە ٠٠

**ماموستا :** بەڵێ ٠٠ ئـەو پیـاوە خوا ناسـە ، لـەخوا ترسـە ، (سەعیدی کوڕی موسەیب) دوای ئـەوەی پەروەردەی کچەکـەی کرد بەوجۆرە قورئان داوا ئەکات بوو بە نموونە لە زانیاریی و فام و ئەقڵ و

---

(١) ماموستا سەعید لە (٩١)ی کۆچییدا لە تەمەنی (٧٤) ساڵیدا لـە دنیـا دەرچوو ، دوای ئـەوە چەرمەسەرەیەکی زۆر درا لە لایـەن (عەبدول مەلیکی کوڕی مەڕوان)ەوە وە گوناهەکەشیی تەنها ئەوە بوو یاسای ئیسلام رێگەی نەدایە (بەیعەت) بکا بە (وەلید) و (سلیمان)٠ ماموستای بـەڕێز (٥٠) سـاڵ لـە سـەریەك (الله أكبر)ی نوێژ دابەستنی لە دەست دەرنەچووە بە جەماعەت ، وە لـە نوێژا قەت تەماشای هیچ کەسی نەکردووە ٠

ژیریدا ، وە ناوو شۆرەتی دەرکرد و لە هەموو لایەك دەنگی دایەوە «دەنگی زانایی و دانایی و خواناسینی ، نەك سەما و گۆڕانیی !! »

بۆیە هەموو کەس پێی خۆشبوو داوای بکات بۆ کوڕی ••! دیارە مامۆستا سەعید ــ خوا لێی رازی بێت ــ ئەفەرمێ :

« ئەم جۆرە کەسانە هاوکووفی کچی من نین ، کچی من زاناو خواناسە ، کوڕی خەلیفە و ئەمیریش بەو جۆرەیە کە هەمووکەس ئەیزانێ !!

مامۆستا سەعید قوتابیی‌یەکی ئەبێ نازناوی (ئەبوووەداعە) بوو ، رۆژێ پێی ئەڵێت :

خێر بوو ئەمڕۆ دوا کەوتی ••؟

ئەبوووەداعە : خێزانەکەم مرد ، خەریکی شااردنەوەی بووم •• بۆیە دواکەوتم •!!

سەعید : ئەی بۆ هەواڵت نەدایني تا یارمەتیمان بدایتایە ••؟ دەی ئیتر ژنی ترت نەهێناوەتەوە ••؟!

ئەبوووەداعە : بە پێکەنینەوە ئەڵێت ، خوارەحمت پێ بکات هەموو سەروەتی من چوار درهەمە !! کێ ژن بە من ئەدات ••؟!

سەعید : ئەگەر سەعید کچەکەی خۆیت بداتێ •• ئەتەوێ ••؟

ئەبوووەداعە : بەڵێ •• مامۆستا ئەمەوێ ، ئینجا مامۆستا هەر لە ناو ئەڵقەی فەقێکاندا بۆی مارە ئەکات ••؟!!

با ئەوەیش بڵێین ــ وەك سوپاردە ــ کچەکە داوای لە باوکی کردبوو بە پیاوێکی زانا و دانا و خواناسی بدات •

ئەبووەداعە ئەڵێت : ئەو شەوە لە ماڵەوە بووم ؛ کتووپڕ یـەکێ دای لەدەرگا ..!

کێیت ..؟ سەعید : منیش هەرچی سەعید ناو بوو بە دڵما هات ، مامۆستا سەعید نەبێت ، چونکە ئەمە یەکەمجاری بوو لەکاتی ئاوادا لـە دەرگا بدات ، دەرکام کردەوە کەچی ئەبینم مامۆستا سەعیدە ،فەرمووی: ئەوە خۆت و ئەوە ژنت ..!

پێم ناخۆش بوو ئەم شەو تۆ تەنیا بیت و حەلاڵەکـەت لەماڵی منا بمێنێتەوە ! ئەبوو وەداعە ئەڵێت :

بەیانی‌یەکیان هەڵسام بڕۆم بۆ دەرز خوێندن بۆ لای مامـۆستا ، کەچی خێزانەکەم چمکی‌سیاڵەتەی گرتم و وتی دانیشە با زانیاری‌یەکەی «باوکمت» فێر بکەم ، ئیتر بۆ کوێ ئەڕۆیت ..؟!

کاکە ئومێد ! ئەوانەن نموونەی موسڵمانی راستەقینە و خوانـاس ، نەك ئێمەی ماددیی و پوولەکیی ..!! نەك مرۆڤەکانی سەدەی زانیاریی !! چونکە هەروەك ئاژەڵ بفرۆشێ مامەڵەی ئەکات و سەروخوار ئەکات و ئەیکات بە قوربانی خۆی ، واتە ئیسلام ئافرەتی رزگار کرد لە زیندەبەچاڵ کردنی سەردەمی نەفامیی ، بەڵام داخەکەم دیسانەوە گەڕایەوە بۆ ئەوێ، بەڵام ئێستا بە شێوە و شێوازێکی تر !!

٢ ــ هەڵبژاردنی ئافرەتێك لە خێزانێکی ناودار بە چاك و رۆچوو لـە رەوشت و ئاینداریدا ، چونکـە گرۆی ئادەمیزاد وەك (کان)وایـە هەڵئەکەوێ بەشێکی لە بەشێکی تری باشتر بێت ! جا لەبەر ئەوە پێویستە ومرۆڤ هەوڵ بدات تا بەشکوم لە بەشە باشەکەیان بەدەست بێنێ .. بۆیە پێشەوامان پێغەمبەر ــ صلى الله عليه وسلم ــ ئەفەرمێ :

**« الناس معادن في الخير والشر ، خيارهم في الجاهلية ، خيارهم في الاسلام اذا فقهوا »** طيالیس گێڕاویەتیەوە .

هەر ئاماژە بەم مەبەستەیە ئەم فەرموودانەیشە :

**« تخيّروا لنطفكم فان العرق دسائس » ئیبن ماجە گێڕاویەتەوە ٠**

**« اطلبوا الاكفاء لنطفكم فان الرجل ربّما اشبه أخواله ٠٠ »**

**ئیبن عەدیی ٠ « تخيّروا لنطفكم فان النساء يلدن أشباه اخوانهن واخواتهن » ٠**

کاکە ئومێد ؛ ئەم کۆمەڵە فەرموودانە پەند و ئامۆژگارییەکی قوڵمان دائەدەن سەبارەت بە هەڵبژاردنی هاوسەر ، پێش ئەوەی گیرۆدەی دەردبین !!

وە موسڵمان رێنموونی ئەکەن – چ پیاو ، چ ئافرەت –کە پێلکەیەنی پاك و خاوێن هەڵبژێرن بۆ (نوۆە)کەیان ٠٠

بۆیە خەلیفەی موسڵمانان – عوسمانی کوڕی عەففان – خوا لێی رازی بێت – ئەیفەرموو :

« رۆڵەکەم ئەوەی ژن ئەهێنێ وەك کەسێك وایە درەختێك بنێژێ ٠٠! کەواتە با مرۆڤ بزانێ لە چ جێگایەکدا ئەینێژێ ٠٠٠ » ٠

**ئومێد :** مامۆستا گیان ؛ کەوابوو هەڵە و نارەوایی لە ئێمەوە دروست ئەبێ ، بۆیە ئەم هەموو شەڕو هەراو ئاژاوەیە پەیدا ئەبێت ، تەماشا ئەکەی ئەو ئافرەتە ئەڕواو ئەمیان تەلاق ئەدرێ و ئەویان سکاڵای خۆی ئەکات ٠٠!

ئەگینە ئیسلام پرۆگرامی ژن خواستنی داناوە ، من بڕوام وایە هەرکەس بەو پرۆگرامە رەفتار بکات قەت تووشی هەڵە نابێت ٠

مامۆستا ؛ داوات لێ ئەکەم پتر ئەم یاسایە رۆشن بکەرەوە بۆمان تازیاتر بەهرە مەندبین ٠

**مامۆستا** : کوڕە شیرینەکەم ؛ ڕاستە هەر کەسێك ئەم کەتەلۆکە بگرێ بەدەستەوە و لەکاتی پێویستا بیخاتە پێش چاو ، هەروەك دەرمان بکڕێ ئەم دەرمانکە و ئەو دەرمانکە ، سەد لە سەد سەرکەوتوو ئەبێ و گیر و گرفت نایەتە ڕێگەی لە پشەرۆژا بەڵام ئیسلام چی بکات لە ئێمە کە بەرنامەکەی پیادە ناکەین ؟! لاوەکان لە پەلەپەلی خۆیاندا ملی خۆیان ئەکەن بەپەتەوە ..! ئەوەیش کاروباری ئافرەتی بەدەستە ماددە کوێری ئەکات ، وەکێ پارە و پووڵی زۆری بداتێ ئەوە پیاوی باشە !! بۆیە سەرئەنجام دادگاکان وەڕس ئەبن و هەر ڕۆژەی چەندان داوا و سکاڵا تۆمار ئەکەن .

ئەم ڕچە و ڕێبازە کە ئیسلام دەستی بۆراکێشاوە سەبارەت بە ژن خواستن لای زانیاریش ڕێك و پەسەندە چونکە زانیاریی ڕەگەز ناسین ئەڵێت :

منداڵ وەسب و خووی باوك و دایك هەڵئەگرێ ، چ تەنیی و ، ، چ ژیریی .. ، .

٣ ــ هەڵبژاردنی ئافرەتێك خزم نەبێت ..

واتە خواستنی ئافرەتێکی بێگانە ، بۆ ئەوەی منداڵی نەجیم و لێهاتوو جوامێری لێ بکەوێتە وە .. بۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمان ــ صلی الله علیه وسلم ــ فەرمووی :

**« اغتربوا ولا تضوَوا » .**

وە بۆ ئەوەی لە نەخۆشیە ڕەگەزییەکان بپارێزرێ ، ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە ناسین و خزمایەتی ناو گەلانی پێ زیادئەبێ !! ئەم فەرموودەیەش ئاماژە بەم مەبەستە ئەکات : **« لا تنكحوا القرابة ، فان الولد يخلق ضاوياً ..»** بێجگە لەمەیش زانیاریی تازە سەلماندوویەتی و ددانی ناوە بەوەدا کە ئافرەتی خزم ئەبێ بەهۆی ئەوە کە هەر خوویەك لەوبنەماڵەدابێت ئەیگوێزێتەوە بۆ منداڵەکەیش .

٤ ـ هەڵبژاردنی کچ ٠٠

بەڵێ ـ کاکە ئومێد : ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەم خاڵەیش بەرچاو ئەگرێ بۆ ئەوەی خۆشەویستی لە نێوان ژن و مێردا بەردەوام بێت !! چونکە بێوەژن وا ئەبێ مێردی دووەمی ناچەفێ بەدڵیەوە و وەك مێردی یەکەمی نابێت لە خووڕەوشتا ٠!

بەڵام کچ چونکە بۆ یەکەمجارە سەر ئەکات بەدەرگای شووکردنا هەرجۆربێت پێی رازی ئەبێت و لەگەڵی رادێت ، واتە بەبوون و نەبوون دائەکەوێ ٠٠!! پێغەمبەری خۆشەویستمان ـ صلى الله عليه وسلم ـ بۆیە ئەفەرمێ :

**« عليكم بالأبكار فانهنّ أعزب أفوهاا ، وانتق أرحاماً ، واقل خَبَّاً وارضى باليسير ٠٠ » ٠**

**ئومێد :** مامۆستا ؛ جا ئەگەر تەنها کچ پەسەند بێت لە ئیسلاما ئەو بێوەژنانە چی بکەن کە مێردیان نەماوە و ئێستا منالیان بەسەرەوە جێماوە ٠٠؟!

**مامۆستا :** کاکە ئومێد ؛ ئەم خاڵە چوارەمینە مەسەلەیەکی زۆربەیی و کاتیە ، وە نەبێت ئیتر نیکاحی بێوەژن دانەمەزرێ و ئەبێ هەر ئەوانیش بمێنێتەوە ! نەخێر بەڵکو مارەکردنی بێوەژن وا ئەبێت کە مایەی رەزامەندیی خوا و سەرفرازیی هەردوو جیهان بێت ٠٠ وەك بێوەژنێکی بێ لەلە و بێ داڵدە ، وەیا منداڵ دەورەیان دابێت ٠٠ چونکە قورئان ئەفەرمێ :

**« وتعاونوا على البر والتقوى » ٠**

کاکە ئومێد ! بەندێکی تر پێویستە ـ لەم مەسەلەی ژن هێنانەدا پێش چاو بگیرێ ئەویش بریتیە لەهەڵبژاردنی ئافرەتێك کە لەرێی زاوزێدابێت ٠

بەڵێ ‥ ئاینی ئیسلام مرۆڤ هەڵئەنێت بۆ هەڵبژاردنی ئافرەتێك كە زاوزێ بكات ، دیارە سوودو كەڵكی هێجگار فراوانە بەتایبەت لەكاتی هەراو ئاژاوە و جەنگدا ، چونكە زۆربەی پیاوان تیائەچن و دانیشتووی وڵات ئەكەم ئەبێتەوە ‥ بۆیە دەوڵەتان دوای شەڕو ئاژاوە خەڵك هان ئەدەن بۆ ژن هێنان !! سەبارەت بەم مەبەستەیە ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ

« تزوّجوا الولود ، فاني مكاثر بكم الأمم ‥ »(١) ۰

**ئومێد** : جا مامۆستا گیان ؛ ئەبێ چۆن بزانرێت ئەو ئافرەتە منالی ئەبێ یا نایبێت ؟!

**ماموستا** : كاكە ئومێد ئەمە چەند نیشانەیەكی هەیە :

یەكەم: سەلامەت بێ لەو نە خۆشیانە ئەبنە هۆی بەرگری زاوزێ، ئەمەیش زۆر جار پزیشكە پسپۆڕەكان ئەیزانن ۰

دووەم : تێبینی و سەرنجدانی دایكی و خوشكە شوو كردووەكانی‥ واتە ئەگەر ئەوان نەزۆك بن وا ئەمیش بەپێی تەجروبە و تاقیكردنەوە نەزۆك ئەبێ ‥!!

كاكە ئومێد ؛ ئەمانە بۆم باسكردی چەند خاڵێكی سەرەكی بوون ئاینی پیرۆزی ئیسلام پێش چاوی گرتوون ، بۆ ئەوەی مرۆڤ هەر لە بناغەوە لەسەر نەخشە بڕوات تا لە دوا ڕۆژا پەشیمانی بە دواوە نەبێت ۰

چەند بەندێكی تریش هەن ـ بێجگە لەوانە پێویستە ئەوانیش پێش‌چاو بگیرێن ، وەك چاوپێكەوتن و تەماشاكردنی كوڕ و كچ بۆ یەكتر ، وە هەروەها نابێ زۆر لە ئافرەتەكە بكرێ ، چونكە ئەم خاڵانە ئەبنە هۆی بەردەوام بوونی نیكاحەكە لەنێوان هەردوولادا ، بۆیە (زاناكان) لەم بارەوە زۆر لەسەری ڕۆیشتوون و سەر دێڕی تایبەتیان بۆ

---

(١) ئەبو داود و نیسائی و حاكیم ۰

نووسیوه بەناوونیشانی (صیفەتەکانی هاوکوفئی) ، پتر لە مانەی باسمان کرد چەندەها شتی تریان نووسیووە ..(١) .

بێگومانم کە هەرکەسێك بەپێی ئەم کەتەلۆکە بجوولێتەوە تووشی هیچ گرێ و گۆتاڵێك نابێت، وە دوور ئەبێت لە دووبەرەکی و پەرتەوازیی لە ژیاندا . کاکە ئومێد ؟ ئەمانە هەندێ کەڵك و سوودی ژن هێنان بوون، لەگەڵ وەسپی ئەو ئافرەتەدا کە بخوازرێ بۆم باسکردی لە سەر داوای خۆت ، هیوام وایە تۆیش و هەموو هاوڵەکانت بەپێی ئەم کەتەلۆکەیە رەفتار بکەن ، ئیتر لە پەنای خوای گەورەدا بێت .

**ئومێد** : مامۆستا گیان ؛ خوا بە لوتفی خۆی یارمەتیمان بدات بۆ پیادەکردنی بەرنامەکانی ئیسلام ، وە وێنەی تۆیشمان بۆ زیاد بکات .

---

(١) سەرنجێکی (إحیاء علوم الدین)بکە ، بەرگی دوو ، باسی (مایراعی حالة العقد من أحوال المرأة وشروط العقد)وە سەیری شەریعەتی ئیسلام بکە . بەرگی سێهەم ص١٣٨ .

# دیمەنی پێنجەم

[ لە کاتێکی ناوەختا مام عەلی بەپەلە خۆی ئەکات بە ژوورەکەی مامۆستادا ، هەر دیاربوو بەڕەنگی شڵەژاوو هەڵبرسکاویا تووشی دەرد و خەفەتێکی گەورە بووە •• بەڵێ دانیشت و دوای بەخێرهاتن کردن چرە دووکەڵێك لە دەمیەوە هاتە دەرەوە و بە ئاهوناڵەیەکەوە ] •

**مامعەلی :** [ ئای چی بکەم لەدەست ئەولادی ناسالح ؟! ئینجا [ هەناسەیەکی قووڵ هەڵئەکێشێت و ڕووئەکاتە مامۆستا ]

مامۆستا : من ئێستا بیرم کردۆتەوە کە ئەم منالآنەمان بۆیە ئەوەندە بێ ڕەوشت و خراپن •• لەگەڵ خۆماندا و لەگەڵ دراوسێدا و لەگەڵ هاوڕێ یاندا ، وە لە ئەنجامیشا خوا ناناسن ، تازە بیرم کردۆتەوە کە بۆیە ئاوان چونکە بە گوێرەی ئیسلام پەروەردە ناکرێن ! دیارە گەڕەك و کۆلآن و شەقام چۆن ڕەفتار بکەن ئەمانیش وا دەرئەچن ••!!

باشە مامۆستا گیان ؟ بەپێی شەریعەتی ئیسلام چۆنیان پەروەردە بکەین ••؟ بەڵکو ئێمەیش و هەموو کۆمەڵیش بحەوێینەوە •

**مامۆستا :** مام عەلی ! لەبەرئەوەی کە منال ڕۆڵەی باشەرۆژە ، وەهەموو لایەکمان چاوەڕوانی ئەوانین کاروباری وڵات بەنبەڕێوە •• لەبەر ئەوە هەر لە ڕۆژی لەدایك بوونیەوە ـ بەڵکو پێش ژن هێنان ـ ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەرك و پێویستیەکانی ئەدات بەسەر مرۆڤدا ، وە داوا ئەکات تەنها چاوترووکاندنێکیش لێیان بێ ئاگا نەبێت ، وە داوا ئەکات کە هەمووکات لە ژێر چاودێریا بژین ، بۆیە هەر لە یەکەم ڕۆژی ژیانیەوە نەخشە دائەنێ بۆ باوك و دایك بەم شێوەیەی خوارەوە :

١ ـ ئافرەتێکی خواناس و لەخواترس و شارەزا بە بەرنامەی ئیسلام بکرێ بەدایکی •

٢ ـ پێخۆشحاڵی خۆی دەربڕێ لـە ڕۆژی لە دایك بوونیـا ، بێ جیاوازیی لە نێوان کچ و کوڕدا ، واتـە بەو شێوە نەء ئەگـەر کوڕ بوو ئەهلی گەڕەك کۆبکاتەوە و شایی و زەماوەند بگێڕێ ! خۆ ئەگەر کچیش بوو خۆی مات و زویر بکات و ژنانی گەڕەکیش سەرخۆشی لێ بکەن !!

بەڕاستیی ـ مام عـەلی ـ ئـەمجۆرە کردەوانـە زۆر زۆرن لـەناو موسڵمانانی ئەمڕۆدا !! لەکاتێکیشا ئەمە خوو نەریتی سەردەمی نەفامی و پێش ئیسلامە ..!

**( واذا بشر أحدهم بالأنثى ظلّ وجهه مسوداً وهو كظيم يتوارى من القوم من سوء مابشر بـه أيمسكه على هون ام يدسـه في التراب الا ساء يحكمون ) النحل/٥٨ـ٥٩ .**

٣ ـ بانگ بەگوێی ڕاستیدا بگوترێ ، قامەتیش بەگوێی چەپیدا .

٤ ـ شتێکی شیرینی و ووردە هاڕراوە بهێنرێ بـە مەڵاشوویدا وەك خورما ، شەکراو ، وە هەرووەها .

٥ ـ ڕۆژی حەوتەمی لـەدایك بوونی سـەری بتاشرێ و مووەکانی بکێشرێن بە (زیو) داو بدرێ بە هەژاران .

**مام عەلی :** مامۆستا گیان ؛ من تا ئێستا ئەمەم نەبیستووە ، جـا بۆچی سەری بتاشرێ ؟ وە ئەبێ فەلسەفەی چیبێ ..؟

**مامۆستا :** سەراپا پڕە لە قازانج و کەلك کە ئەمانە هەندێکیانن:

● تەندروستیی و لـەش سـاغیی بۆ مناڵەکـە ، چونکـە ـ وەك پزیشکەکانیش ئەڵێن : تەنی بەهێز ئەبێت ، لەولایشەوە چاوو گوێ و پووکیشی پێ بەهرەمەند ئەبن .

● باری کۆمەڵایەتی بەهێز ئەبێت ، چونکە کاتێ کێشانەی مووی سەری مناڵەکە زیو بدرێ بەهـەژار و بێ نەوا ، بێگومان دۆخی کۆمەڵ

ئەگۆڕێ ، ئامارە بەم سوود و کەڵکانەیە ئەم فەرموودەیە کە (ئەنەسی کوڕی مالیك) ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ ئەیگێڕێتەوە :

( أن رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ أمر بحلق رأس الحسن والحسين يوم سابعهما فحلقا وتصدق بوزنة فضة ) •

**مامەلی : مامۆستا گیان ؛ چەند ڕۆژ لەدوای لەدایك بوونی ناو بنرێ ؟ باشە ، وەچ ناوێك پەسەندە ••؟؟**

**مامۆستا :** خاوەن منال ئارەزووی خۆیەتی ، لەرۆژی یەکەمدا ناوی ئەنێ ، یاسێهەم ، یارۆژی حەوتەم ، وەیا دواتر وە بۆ هەریەکە لەمانە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ هەیە وە سەبارەت بەناوی خۆش پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمێ :

**( إنكم تدعون يوم القيامة بأسمائكم وباسماء آبائكم فأحسنوا اسماءكم ) •**

واتە لە ڕۆژی قیامەتا بەناوی خۆتان و باوکتانەوە بانگ ئەکرێن کەوابوو ناوەکانتان جوان و شیرین بنێن •

کەواتە هەر ناوێك مانا و واتایەکی ناپەسەند و ناشیرین ببەخشێ منالەکەی ناونەنێن •

دیسانەوە هەر ناوێك منالەکەی پێ شەرمەزار و تەریق بێتەوە بەو ناوەوە ناوی نەنێن ، چونکە دایکی موسڵمانان خاتوو عائشە ئەفەرمێ پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ گەلێك ناوی ناشیرین و ناخۆشی گۆڕی بۆ نموونە :

- (حەرب) بە (سیلم) •
- (مضطجع) بە (منبعث) •
- (حزن) بە (سەهل) •
- (عاصیە) بە (جەمیلە) •

هەروەها ناوێك مانای شووم و ڕەش‌بینی بگەیەنێ و ناوێکیش تەنها شایەنی خوابێت وەك :

« ئەحەد) ، (صەمەد) ، (ڕەزاق) •

- ناوێك مانای بەندایەتی بگەیەنێ بۆ غەیری خوا وەکو (عەبدول کەعبە) (عەبدول‌حوسەین) •
- ناوێك مانای عشق و ئەوین بازیی و بەرەڵلایی بەخشێ ، چونکە موسڵمان ئەبێ هەمووکات جیاوازیەکی ببێ لە کۆمەڵی ناموسڵمان، تا ناوی ناموسڵمانانە نەکەوێتە ناو موسڵمانەکانەوە • بۆیە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ داوا ئەکات لە موسڵمانان کە ناوی منداڵەکانیان بە ناوی پێغەمبەرانەوە ناوبنێن ، وە ناوێ هەڵبژێرن کە بەندایەتی خوا بگەیەنێ وەك :

(عبد الرحمن،عبدالله ۰۰۰) « **إن احب اسمائكم الى الله ـ عز وجل ـ عبدالله ، وعبدالرحمن » موسلم** •

بەڵام ، زۆر بەداخەوە ، ئەوانەی کە لە ئاسایشدا ناژین ، ـ چونکە وەك میکرۆب وان هەرکات کۆمەڵ پێی زانین ئەیانناسێ ـ جارێکی تر تۆوی پەرتەوازیان وەشاند ، وە ڕەگەزپەرستیان زیندو و کردەوە و هەڵسان خەڵکیان تۆران لەناوی پیاوچاکان ، ئینجا زۆربەی موسڵمانەکان بە خەبەر نەهاتن لە پیلانەکەیان وە نەیا نزانی نیازی ژهراویان چیە ؟

هەڵسان لایان دا لە ناوی پێغەمبەران و هاوڵە بەشەرەفەکانی ، وە لەباتی ئەوانە جۆرە ناوێکی تازە ناشراویان داهێنا •

زۆر بە هیوام ـ پشت بەخوا ـ هەموو بەجارێ بیربکەینەوە لەم کارەساتە ، وە دوژمنی خۆمان بناسین و ناری بنێین و لە وڵات شار بەدەری کەین •

٦ ـ حەوتم •• واتە خاڵێکی تر کە ئیسلام پێش چاوی گرتووە سەبارەت بەمناڵ حەوتمە ؛ بەم چەشنە حەیوان سەر بڕێ و دابەشی کات

بەسەر دەروو دراوسێدا ، بۆیە پێغەمبەر ـ صلی اللّه علیه وسلم ـ ئەفەرمێ:
« كل غلام رهينة بعقيقته تذبح عنه يوم سابعه ويسمى فيه ويحلق رأسه » •
( اِلزموا أولادكم وأحسنوا أدبهم) بەمانای دەست لە منداڵەکانتان بەرمەدەن،

**مامعەلی :** مامۆستا ؛ سود و کەڵکی ئەم حەوتمە چییە ••؟

**مامۆستا :** مام عەلی ؛ خێر و بێری ئەم حەوتمە زۆر زۆرە ، ئەمانە هەندێکیانن :

- بۆ یەکەمجار پێ ئەنێتە دەرگای ژیان ئیسلام فێری خێرو چاکەی ئەکات •
- فیدیە و بریتی‌یە لە بەلاو گیروگرفت ، هەروەك خوا ـ جل جلاله ـ بریتی و فیدیەی (ئیسماعیلی) نارد •
- دەربڕینی خۆشیی و شادیە بە لەدایك بوونی ئەندام و تاکێکی موسڵمانان هەروەك پێغەمبەرمان ـ صلی اللّه علیه وسلم ـ شانازیی پێوە ئەکات لە رۆژی قیامەتا •
- پەرەدان بە خۆشەویستیی و پتەو کردنی پەیوەندیی لە ناو کۆمەڵا، کاتێ لەسەر سفرەی برایەتی و ئاشتیی کۆ ئەبنەوە و شادیی ئەگێڕن بۆ زیاد بوونی ئەندامێکی موسڵمانان •

**مامعەلی :** مامۆستا ؛ دیارە ئیسلام زۆر بایەخ ئەدات بەخۆشیی و ژیانی ئاسوودەیی بۆئادەمیزاد ، ئایا بێجگە لەمە کات و وەختی تر هەیە شادیی و خۆشیی تیا بنوێنرێ ، وە خۆراکی تیا دروست بکرێ و خەڵکی لەسەر کۆبکرێتەوە و یارمەیتی هەژارانی پێ بدرێ ••؟!

**مامۆستا :** مام عەلی ؛ پرسیارەکەتم گەلێك پێخۆشە ، چونکە پەیوەندی بەحەوتمەوە هەیە ، جا فەرموو ئەمانە هەندێکیانن :

× میوانداریی •
× خۆراکی لەدایك بوونی منداڵ /الخَرس/ •
× خۆراکی بانگ‌کردن /المأدبة/ •

× ژن هێنان و زەماوەند /العرس/ •
× حەوتم /العقیقة/ •
× خەتەنەکردن /الاختتان/ •
× و دروست کردنی خواردەمەنی بۆخاوەن مردوو • نەك خواردەمەنی پێدروست بکرێ !
× گەڕانەوە لەسەفەر •
× لەکاتی تەواوبوونی خانووبێنادا ، واتە دوای تەواوبوونی هەریەکە لەمانە شەریعەتی ئیسلام بەکردەوەیەکی پەسەندی داناوە خۆراك دان بە هەژاران و دراوسێ •

بە کورتێ: ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەمووکات حەزی لە دروستکردنی خۆشەویستی و یارمەتی و دەست راکێشانە بۆ هەموو لایەك لە هەموو کاتێکا ، بۆیە چەندان کاتی تری داناوە وەك جەژنەکانی قوربان و رەمەزان و شەوڕەوی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەمەککەوە بۆ (قودس)ی پیرۆز کە ئێستا ـ بەداخەوە ـ وا لەژێر چەپۆکی جوولەکەی ناپاکا !! وە موسڵمانەکانیش چاویان لێ داخستووە و بەشتی پڕوپووچەوە خەریك کراون ، تەنانەت هەر باسیشی ناکەن مەگەر جاروبار وەك لە وتاری هەینی و جۆرە ئاهەنگێکا ، باسکردنەکەیشی رۆحی نیە بەڵکو لەبەر (وەزنی شیعرە) !! هیوادارم هەموولایەك (قودسی) لەبیر نەچێتەوە و پەلاماری شێرانەی بۆبرێ و هەڵمەتی بۆ ببرێ لەو رێچەوە کە پاڵەوانی ئیسلام و نەوەی کوردی خواناس ـ صلاح‌الدین ئەیوبی‌پایا رۆیشت •

٧ ـ ئەوەیە منالەکە خەتەنە بکرێ لە سەرەتای هاتنە دنیایەوە ، چونکە خەتەنە دروشمی ئیسلامە ، واتە نیشانەیەکە موسڵمانی پێ جیا ئەکرێتەوە لە ناموسڵمان •

ئەم خەتەنە بەرامبەر بەنێرینە (واجب)ە،وە ئەوکەسەی هەوڵی بۆ نەدا لەپێش باڵغ بوونیدا ئەوە کارێکی ناپەسەندی کردووە و خۆی تووشی گوناهو تاوان کردووە •

**مامعەلی :** مامۆستا ؛ قازانج و سوودی خەتەنە چییە ؟ وا ئیسلام ئەوەندە بایەخی ئەداتێ ؟!

**مامۆستا :** مام عەلی ؛ پێش هەموو شتێك بزانە هەرچی ئیسلام فەرمانی کردووە بەکردنی ، یا بە نەکردنی ئەوە پڕە لە کەڵك و سوود بۆ تاکیش و کۆمەڵیش با ئێمەیش هیچی لێ نەزانین ، بەڵام ئەمانە هەندێ سوودو کەڵکی خەتەنەن :

× دروشمی ئیسلامە .

× بەشێکە لە ئاینی (ئیبراهیم پێغەمبەر) ـ صلى الله عليه وسلم ـ کە ئەمەیش نیشانەی یەکیەتی و یەکگرتنی ئاینەکان نیشان ئەدات.

× پیادەکردنی فەرمانی ئیسلامە بێ چەندو چوون .

× پاك و خاوێنی و ئارایشی تێدایە .

× شتێکی لونجاوە لەگەڵ سروشتی ئادەمیزادا ، وانە مرۆڤ ئەپارێزێ لە چەندەها نەخۆشی[1].. ئاماژە بەم کەڵکانەیە ئەم فەرموودەیە کە ئەفەرمێ :

( من الفطرة : المضمضة ، والاستنشاق ، وقص الشارب ، والاختتان ) بوخاری وموسلیم .

مام عەلی ؛ ئاگات لێیە ئیسلام چەند گرنگی ئەدات بە منداڵ ..؟ ئەوەتە هەر لە دایك ئەبێ داوا ئەکات چرکەیەك لێی بێ ئاگا نەبین .. بانگ ، قامەت ، ناونانی ، شادیی بۆگێڕان ، خەتەنە کردنی ، دیارە ئەمەیش ئەوەمان نیشان ئەدات کە هەر بەمناڵی خوویان بدەینێ ، وەهەموو ئەرك و داخوازییەکانیان جێبەجێ بکەین .. بەشکوم ئەوانیش لە پاشەڕۆژا دوای ئێمە بکەون ، هەروەك ئەوەیشمان بیر ئەخاتەوە کە

---

(١) دکتۆر (صبري القباني) لە کتێبی « حياتنا الجنسية » داهەندێك لە سوودەکان خەتەنەی نووسیوە .

منالّ له منالّیدا ئەوەندە ئەرکی هەیە ! خۆ ئەگەر گەورە بوونەبێ ئەرکی چۆن بێت ....؟!

بە کورتیی :

منالّ سپاردەیەکــە خوای گەورە ئەیداتــە دەست باوك و دایك وە ئەو دایك و باوکە بەرپرسیار ئەبن لێیان لە پاشەڕۆژا ، ئەگەر پەروەردەی چاکیان بکەن ئــەوا پاداشتیان چاك ئەبێ ، ئەگینــە گیرۆدەی پاشەڕۆژی خۆیان ئەبن .

سەبارەت بەم مانایەیە ئــەم فەرمودەیە کــە : (عەبدوڵلای کوڕی عومەر) خوا لێیان رازی بێت ـ ئەیگێڕێتەوە لــە پێغەمبــەرەوە ـ صلى الله عليه وسلم ـ :ـ

( هەمووتان شــوانن ، وە بــە تێکرا بــەرسپارن لــە ژێردەستە و ڕەعیەتتان :ـ

أ ـ پێشەوا ـ ئیمام ـ شوان و چاودێریکەری ژێردەستەکانیەتی

ب ـ خاوەن خێزان ، شوانە لە هــەستان و جم و جووڵەی خێزانەکەی وەبەرپرسیارە لێیان .

ج ـ ئافرەت کــەیبــانوو چاودێریکــەری مــاڵی مێردەکــەیەتی و بــەر پرسیاریەتیی .

د ـ کارگوزار و خزمەتکار ، شوانی ماڵ و سامانی ئاغاکەیەتی ، وە بەرپرسیاریەتی .

هـ ـ ئینجا بەگشتی هەمووتان شوان و بەرپرسیارن لەژێر دەستەتان .

مام عەلی ؛ ئیمامی غەزالیش ئەفــەرمێ : ( منالّ واشێلراوە بەیــەکا دەست ئەدات بۆ وەرگرتنی چاکە و خراپە ) .

**مامعەلی : مامۆستا ؛** مەبەستت ئەوەیە منالّ چۆن پەروەردە بکرێ لە پاشەڕۆژا وائەبێت ..؟!

**ماموٚستا :** بەڵێ ‎•• چۆن پـەروەردە بکرێ وا دەرئەئەچێت بۆیـە گەورەو پێشەوامان حەزرەتی محمد ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەفەرمێ :

( الزموا اولادکم واحسنوا ادبهم ) واتە : دەست لە منالەکانتان بەرمەدەن وە ئاداب و وێلی باشیان داوە •

مام عەلی ؛ لەم فەرموودەدا وامان بۆ دەرئەکەوێ کە پێویستە منال هەموو دات لەژێر چاودێریی باوك و دایکا گەورە بکرێ ، بەم شێوەیەی خوارەوە :ـ

یەکەم : یەکسانیی ئێرومێ لە پەروەردەدا ، واتە بێجیاوازیی لە نێوانیانا ، چونکە ئاینیی ئیسلام لایەکیانی خۆشتر ناوێ لەوی تریان نەك جیاوازیی بخاتـە نێوانیانەوە ، هـەروەك لـە مافەکانی تردا وەك یـەك سەیریان ئەکات •

ئیسلام ڕووئەکاتە کاربـەدەستی منـاڵ و داوای لێ ئـەکات کـە ئێرومێ یـەك پەروەردەیان هـەیـە ، هەریەکـەیەن بـەپێی سروشت و لەیاقەتی خۆی •• سەبارەت بە وێل و پەروەردەی ئافرەتە ـ بەتایبەت ـ کە پێغەمبەرمان ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەفەرمێ :

**( من كانت له إبنـة فأدّبهـا فأحسـن تأديبهـا ، وربّاها فأحسن تربيتها ، وغذاها فأحسن غذائها كانت له وقاية من النار ) •**

هەروها پێویستە منال دڵ و دەروون و مێشکی پەیوەست بکرێ بەم شتانەی خوارەوە :

١ ـ ببەسترێ بە باوەڕەوە ، واتە لـە سەرەتای دەرکەوتنی نیشانەی ژیریی و ئەقڵ و ئاوەزووی منالەکەوە،وە هەروها پێویستە پایە بناغەیەکانی ئیسلامی پێ بناسرێ و بخرێنـە مێشکیەوە بـەجۆرێك لەگـەڵ هـەستیا گونجاو بێت ••

- بڕوا بوون بە زات و صیفات و کرداری خوا ـ جل جلاله ـ •
- بڕوا بوون بە فریشتەکانی خوا •

- بڕوا بوون بە بەرنامە و کتێبەکانی •
- بڕواهێنان بە ڕابەران و پێغەمبەرانیی •
- بڕواهێنان بـە ڕۆژی دوایی ، واتـە موحاسەبە و لێ پرسینەوەی کردار و وتار •
- بڕوادان نان بە (قەزا و قەدەر) دا •

وە هەروەهـا شتە غـەیبی و نادیـاریـەکانی تر ، وەک پرسـیاری فریشتەکانی گۆڕ و سزای گۆڕ و ••• بەهەشت و جەهەنەم و •• هتد•

مام عەلی : لێت روون و ئاشکرا بێ هەرکات بە قوولی بۆی داچیت و بڕوابوون بە خوا بخەیتە قوولایی دلی رۆلەکەتەوە ، ئەوە بێگومان ئەو ڕۆلەیە ئەشوونیمای لە ژێر چاودێریی خوادا ئەبێت ، وە باوەش ئەکات بە پڕۆگرام و رچەی بەرنامەی خوادا • واتە ئیتر تووشی دلە راوکێ و دوو دلی نابێت لە لایەن بیر و باوەڕە نەخۆشەکانەوە ، وەدامەزراوو ، پارێزراو ئەبێت لە هاشاووڵی بێ بوەڕی و بەرەڵلایی و خوانەناسیی •

٢ ـ پەیوەندیی رۆحیی و دەروونیی ، واتە رۆحی منالەکە پالاوتە بکرێ و یارمەتی بدرێ بۆیەك ڕاگرتنی بەهەر هۆیەك بووە ، بۆ ئەمەیش ئایینی پیرۆزی ئیسلام پڕۆگرامی تایبەتی هەیە و نەخشەی بۆ کێشاوە :ـ

أ ـ خووی پێ بدرێتە خوا پەرستی ، بۆیە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمێ :

**( مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع سنين ، واضربوهم عليهـا وهم أبناء عشر ، وفرّقوا بينهم في المضاجع ) •**

واتە فەرمان بدەن بە رۆلەکانتان بە نوێژ لە تەمەنی حەوت سالیدا ، وە لە تەمەنی دە سالیاندا لێیان بدەن لەسەر نوێژ ، وە لە جێگەی نووستندا لەیەك جیایان بکەنەوە وە هەروەها ، ئەبێ ئەو منالە تێ بگەیەنرێ کـە ئیسلام تەنها نوێژ و رۆژو و حەج و زەکات نیە ـ وەك وەزعی خەلکی

وانیشان ئەدات ـ بەڵکو ئەوەیشە و هەرچی کردەوەی چاك و رێك هەیە ئیسلام فەرمانی پێ ئەکات :

**( إعملوا بطاعة الله ، واتقوا معاصي الله ، ومروا أولادکم بامتثال الأوامر ، واجتناب النواهي فذلك وقاية لهم ولکم من النار ) ئیبن جەریر و ئیبن المنذر .**

ب ـ رواندنی خۆشەویستی قورئان لەدڵ و مێشکیا .. واتە هەوڵ بدرێ قورئانی پیرۆزی فێر بکرێ بەگوێرەی تەوانا ، هەروەك پێویستە پێنی لەبەر بکرێ .

(إبن خلدون) لە پەڕاوی (مقدمە) داو (إبن سینا)یش لە کتێبی (السیاسة)دا ئەڵێت : پێویستە یەکەم شتێ فێری منال بکرێ قورئانی پیرۆزە ، چونکە ئەبێتە هۆی دامەزراندنی خێر و چاکە لە دەروونیا .

وەئیمامی (غەزالی) خوا لێی رازی بێت ـ وەسیەتی کردوە لە کتێبی (إحیاء)دا « بە فێرکردنی منال قورئان و چەندان فەرموودەی پێغەمبەر و داستانی پیاوچاکان و لەگەڵ هەندێ ئەحکامی ئاینی » .

**مام عەلی :** پیاوچاکان چونکە خاوەنی فام هەست و ریریی بوون منالەکانیان ئەدایە دەست رەوێل دادەر و پەروەردەکەرەوە ، ئەوانیش یەکەم شتێ کە پێوەی خەریك ئەبوون فێرکردن و لەبەرکردنی قورئان بوو تازمانیان بەهێز ئەبوو دەروونیان دائەمرکا و باوەڕ و ئیسلام لە دڵیاندا بنجی دائەکوتی .. بۆیە لە ئەنجامدا بێجگە لە قورئان و ئیسلام هیچ شتێکی تریان بەراست نەئەزانی و نەیان ئەکردە دەستوور و بەرنامە و یاسا ..!! .

**مامعەلی :** مامۆستا ؛ یانی ئەبێ منالەکان بدەینە دەست مامۆستایەکی لە خوا ترس قورئانیان پێ بخوێنێ و پێیان لەبەر بکات ..؟

**مامۆستا :** بەلێ .. مام عەلی ؛ دەخیل سەد دەخیل کەسێك بدۆزەرەوە و بیکە بەمامۆستای رۆڵەکانت ـ چ کوڕ ، چ کچ ـ قورئانیان

فێر بکات •• چونکە دەرمانی دەردمان تەنها قورئانە ، وەئاخیری ئەم ئوممەتە دانامرکێ بەوە نەبێت کە سەرەتاکەی پێ دامرکاوە •

ئەگەر ئاوات ،کرد ، ئینجا رۆڵەکەت وای لێ دێت لە پاشەڕۆژا پەنجەی بۆ رابێشرێت لە جوامێرێتی و ڕەوشت پاکیدا ، چونکە لەسەر ڕێگەی راستە و ڕێگەی بەختیاریی داوەتەبەر •

ئاماژە بەم مەبەستانەیە ئەم فەرموودەی پێغەمبەرەیە ـ صلی اللّه علیه وسلم ـ کە ئەفەرمێ :

**( أدّبوا أولادكم على ثلاث خصال : حبّ نبيكم ، وحبّ آل بيته ، وتلاوة القرآن ، فان حملة القرآن في ظل عرش الله ، يوم لا ظل إلا ظله مع أنبيائه وأصفيائه ) طه بەرانی گێراویەتەوە •**

ج ـ خۆشەویستی مزگەوت لە دەروونیا بڕوێنرێ ••

بەڵێ •• مزگەوت زۆر گرنگە لە ئیسلاما • چونکە کۆمەڵانی ڕابووردومان لە مزگەوتا پێگەیشتن و بنیاتی کۆمەڵیان نا •• وە هەتا هەتایە مزگەوت دەوری سەرەکی ئەبینێ لە دروستکردن و پێگەیاندنی کۆمەڵ و تاکدا ، باکافران سەد هەزار فڕ و فێڵ لێدەن بۆنە هێشتنی مزگەوت چونکە بێ مزگەوت :

× بۆت نالوێ منالەکەت پێ بگەیەنی و دەنگی (الله اكبر)ی پێ ببیسی •
× موسڵمان فێری یاساکانی ئاین و ژیانی دنیا و حەڵاڵ و حەرام نابێت •
× موسڵمان قورئان وەرناگرێ و فێری ووردەکاریەکانی نابێت •
× ناکونجێ موسڵمانەکان ـ بەکۆمەڵ و تێکڕا ـ ئاگاداری ئێش و ئازاری یەکتر بن •
× ڕێك ناکەوێ موسڵمانەکان کۆبنەوە و ئاڵ و گۆڕی خۆشەویستی و برایەتی و یارمەتی یەکتر بکەن ••• وە هەروەها سەدەها کەڵك

و سووده‌کانی‌تری مزگه‌وت که هه‌ن و پێویست ناکات په‌نجه‌یان بۆ ڕاکێشین ، هێما و ئاماژه به‌م سوودانه‌یه ئه‌م فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ره ـ صلى الله عليه وسلم ـ که ئه‌فه‌رمێ :

**( وما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله ويتدارسون بينهم إلا نزلت عليهم السكينة ، وغشيتهم الرحمة ، وحفتهم الملائكة ، وذكرهم الله فيمن عنده ) موسليم •**

مام عه‌لی : ئیتر به‌هیوام یه‌که‌م مه‌لبه‌ندێ مناله‌که‌ت سه‌ری لێ بدات مزگه‌وت بێ ، وه دوای ئه‌و نه‌هێڵی سێبه‌ری هیچ شوێنێکی تر بکه‌وێته سه‌ری که پێچه‌وانه‌ی مزگه‌وت بێت •

**مام‌عه‌لی :** مامۆستا گیان ؛ خوا پاداشت بداته‌وه ، حه‌ز ئه‌که‌م پتر له‌سه‌ری بڕۆیت و درێژه به‌م باسه بده‌یت •

**مامۆستا :** مام عه‌لی ؛ من به ئه‌رکی سه‌رشانی خۆمی ئه‌زانم ڕۆشن کردنه‌وه‌ی ئه‌م جۆره باسانه ، جا له‌به‌ر ئه‌وه زۆرم پێخۆشه درێژه‌دان به‌م باسه‌یه به‌ڵێ ••• مام عه‌لی ئه‌بێ ئه‌و مناڵه بیر و یاد و زیکری خوا له دلیا جێگیر بکرێ به شێوه‌یه‌ك ئه‌م ڕاستیانه‌ی بۆ ڕاڤه بکرێ :ـ

١ ـ نه‌مریی و مانه‌وه‌ی ئیسلام و به‌که‌ڵك هاتنی بۆ هه‌موو سه‌ده‌یه‌ك •

٢ ـ پێشووه‌کانمان ئه‌و سه‌ربه‌رزیی و سه‌رفرازیه‌ی ده‌ستیان که‌وت به‌هۆی ده‌ست گرتنیانه‌وه بوو به قورئان و یاساکانی قورئانه‌وه •

٣ ـ باسی پێشکه‌وتوویی و شارستانیه‌تی ئیسلام •

٤ ـ باسکردنی ئه‌و نه‌خشه‌یه که دوژمنانی ئیسلام کێشاویانه وه‌ك :ـ

× نه‌خشه‌کانی جووله‌که‌ی ناپاك •

× نه‌خشه‌کانی به‌ره‌ی داگیرکه‌ر •

× نەخشەکانی شیوعیەتی جیهان .

× نەخشەی (صەلیبەت) و خاچە دەروون پیسەکان .

٥ ـ تێ بگەیەنرێ کە نەتەوە و ئوممەتی ئیسلام ناتوانێ بژی و بگات بە چلەپۆپەی ژیان تا قورئان پیادە نەکات ، وەتێ بگەیەنرێ ، کە هەرکرد و کۆششێ بکرێ و لە ژێر ئالآی ئیسلاما نەکرێ ، واتە بەپێی نەخشە و کلێشەی ئیسلام نەبێت ئەوە سەرئەنجام سەرشۆر و ژێردەستەمان ئەکات ، وەك پێشەوامان ـ عومەری کوڕی خەتاب ـ خوا لێی رازی بێت ـ ئەفەرمێ :

( نحن قوم أعزّنا الله بالاسلام ، فمهما ابتغينا العزة بغير ما أعزّنا الله به أذلّنا الله .. ) .

٦ ـ تێ بگەیەنرێ کە ئەم پرژ و بلاویی و ژێردەستیەی کە ئێستا تووشی کۆمەڵی موسڵمانان بووە لەم پەڕ بۆ ئەو پەڕ ، وە هەروەها هۆی سەرکەوتنی لاکویلێ (جوولەکە) بەسەر وڵاتە ئیسلامیەکاندا بەتایبەت (قودس)ی پیرۆز هۆی دوور کەوتنەوەی موسڵمانەکانە لە خوا !!.

حوکم نەکردنە بە بەرنامەی خوا ..! هەڵبژاردنی یاسای ئەم و ئەوە بۆ ژیان ، پشت کردنە لە یاسای خوا .!!

وەك پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمێ :

« **ولا حكم امراؤهم بغير ماأنزل الله إلا سلط الله عليهم عدوهم فاستنفدوا بعض ما في أيديهم ، وما عطلوا كتاب الله وسنة نبيّه إلا جعل الله بأسهم بينهم** » . **بەیهەقی وحاکیم گێڕاویانەتەوە** .

٧ ـ هەندێ وتە هەن لە ناو کۆمەڵدا مەئیووسیی و ڕەشبینیی نیشان ئەدەن ، نەهێڵرێ ئەو جۆرە قسانە بچن بەگوێدا ، وەك : (هەوڵ و کۆشش هیچ سوودی نیە ..!) .

( ئاخرزەمانە ! ئەم خەڵکە بــە منو تۆ چاك نابێت ••!! بە گوڵێ بەهار نایــەت ! خوا خۆی خاوەنی ئــەم دینەیــە ! من و تۆی ناوێ ! دەخیل صەد دەخیل لەم وتانە بپارێزرێ چونکە ئەو هەموو مارە تۆپیوانە دوژمنانی ئیسلام ئەیانخەنە بەر پێمان بۆ ئــەوەی ئێمــە پێش ئــەوەی وەختی مردنمان بێت بمانمرێنن و ئەوانیش دەست بخەنە بەروو بوومی ولاتەکەمانەوە ، ئێمەیش چاوەڕوانی مردن بین ، چونکە ئاخرزەمانە ••!! بۆیە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەفەرمێ :

**( من قال هلك المسلمون فهو اهلكهم ! )** واتە ئەوەی ئــەو شــتانە ئەڵێت ئــەوە خۆی غیرەتی ئیسلامیی لا نــەماوە و وورەی بــەرداوەو ـ بەخۆی بزانێ و نەزانێ ـ بووە بە نۆکەری دوژمنان ، وە نەئایین و نەئیمانی لا نەماوە •• بۆیــە پێویستە موسڵمانەکان حیساب بۆ وتــەی ئەو دەروون نەخۆشانە نەکەن •

وە هەروەها تێ بگەیەنرێ کەداهاتوو پاشەڕۆژ هەر بۆ ئیسلامە ، با ئێستایش وا بەدی نەکرێ ، چونکە ئەوە بوو کاتی خۆی (صەلیبی‌یەکان) زوربەی ولاتــە ئیسلامییەکانیان داگیر کردبوو بە مزگــەوتی (قودس) یشەوە وە نزیکەی یەك صەدە لەژێر حوکمی ناڕەوای ئەواندا بوو ••!! مام علی ؟ ئایا بەخەیاڵی هیچ کەسێکدا ئەهات کــە ئــەم ولاتە ئیسلامیانە ڕۆژی دێت ئازاد ئەبن لەژێر حوکمی ناهەمواری صەلیبیە تێدا ؟!

نەء بەدڵی کەسدا نەئەهات ، تالــەم دوایــەدا خوای گــەورەمان پاڵەوانی بەغیرەت و ئیسلام پەروەر (صلاح‌الدین)ی کوردی خوا نــاسی نارد ، بە هێزی بڕوا و یەکیەتیی ناو موسڵمانەکان رزگاری کرد و دای بەژێر دەستی خاچەکاندا ، بە شێوەیــەك ئێستایش لووتیان ئەتۆزێتەوە و هەتا هەتایە لە بیریان ناچێتەوە •

یا کێ گومانی ئەبرد دوای پەلامارە دڕندانەکەی مەغۆل و تەتار بۆ سەر وڵاتە ئیسلامییەکان ، بەو شێوەیە کە ئەڵێن (هۆلاکۆ)ی نامەرد بە کەللە سەری موسڵمانەکان چەندەها تەپۆڵکەی دروست کرد ..!! کێ بە تەمای ئەوە بوو جارێکی تر دەنگی (الله اکبر)بەرز بێتەوە لەسەر لووتکەی منارەکان ؟!!

کەوابوو ئەو جۆرە قسانە خەڵکی ئەیانکات و ئەبنە هۆی سارد بوونەوەی بانگی بانگ کەران بۆ سەر ڕێگەی ڕاست و دروست ، قسەی دوژمنانە و ئەیانەوێ ئێمە هەر خەوتوو بین و خەبەرمان نەبێتەوە .

مام عەلی : باوەڕ بوون بەخۆ و هیوا و ئاوات و کۆڵ نەدان چەکێکی نەپساوە و مرۆڤ ئەگەیەنێ بەئاوات و مەبەستی بەرز .

کەوابوو پاشەڕۆژ هەر بۆ ئیسلامە ، ئەگەر چی دوژمنانی سەدان پیلان بگێرن ، چونکە موسڵمانەکان ـ سوپاس بۆ خوا ـ خاوەنی بەرنامەیەکن ئەمڕۆش و پاشەڕۆژیش زۆر بە شانازییەوە ئەتوانێ ئادەمیە سەر گەردانەکان هیدایەت بدا و لە تەنگ و چەڵەمەی نەفامیی رزگاریان بکات .. سوپاس بۆ خوا بانگی خوای گەورە ئەمڕۆ لەسەر زەویا بەویەڕی متمانەوە هەنگاو هەڵئەگرێ و قوژبنێکی ئەم زەوییە نییە ئیسلامی بێگەرد خەریکی هیدایەت دان و ڕۆشن کردنەوەی دڵی دانیشتوانی نەبێت .

[ مام عەلی فەرموودەکانی مامۆستای زۆر بەدڵە ، ئەیەوێ زیاتر لە خزمەتیا ئامۆژگاری وەرگرێ و ئەویش بیکا بە دەرز بۆ ڕۆڵەکانی . بەڵام وا دەرئەکەوێ مامۆستا بەڵێنی داوە بە کۆمەڵێ قوتابیی کە دەرزی قورئانیان پێ بڵێ .. بۆیە خوا حافیزی لە مام عەلی کرد و داوای لێ بووردنی لێکرد ] .

**مام عەلی :** ماوەمە هەم دیسان دێمەوە خزمەتت ، وەتا بەیەك ئەگەینەوە لەژێر چاودێریی خوای گەورەدا بیت .

# دیمەنی شەشەم

[ دوای یەك دوو ڕۆژ مام عەلی بێ تاقەتی وتە خۆشەکانی مامۆستا بوو وهاتەوە بۆ خزمەت مامۆستا سلاوی لێکرد و تەوقەی لەگەلا کرد ، ئینجا دوای پشـوودانێك نوێژەکەیان بـە (جەماعەت) کرد و مام عـەلی ڕووئەکاتە مامۆستا ] •

**مامعەلی :** مامۆستا گیـان ؛ لـە دانیشتنی پێشوومەندا هـەندێ فەرمایشت کرد لە بارەی پەروەردەی منالەوە ، بەراستیی زۆر زۆر بـە بایەخ و جێگەدار بوون لە دلی هەموو موسلمانێکدا ئێستایش ئەمـەم بۆ ڕۆشن بکەرەوە کە : هەلس و کەوتی کۆمـەلایەتیی منالەکـە چۆن بێ سوود بـەخشە ؟ ودیا نەخشـەی ناوکۆمـەلی موسلمانیی چۆن بێ بـە گوێرەی بەرنامەی ئیسلام ••؟

**مامۆستا :** مام عەلی ؛ ئەگەر لەبیرت مابێ وتمان پێویستە منـال دل و مێشکی پەیوەست بکرێ بەچەند شتێکەوە یەکەم پەیوەست کردنی بـە باوەڕەوە و دووەم پـەیوەست کردنی ڕۆحی و دەروونیـی کـە هـەردووکیانمان باس کرد ، وا ئێستاش ـ پشت بە خوا ـ (پـەیوەندیی کۆمەلایەتییت) بۆ باس ئەکەم •

مەبەست بەرواندنی مانـای کۆمـەلایـەتی لـە دلی منـالەکـەدا ئەمەیە کە :

منالەکە لە سەرەتای چاوو بیرکردنەوەیدا لە ژیانگـەیەکی پاك و خاوێندا پەروەردە بکرێ ، تا ببێ بە خاوەنی هەموو جۆرە خوویـەکی مەردانە :

بەلام ئایا ئەو ژیانگە کامەیە و چۆنە ••؟

بەڵێ ...ـ مام عەلی ؛ بەپێی لێکدانەوەی پـەروەردەکەران ئـەبێ ئەو منالّه لەگەڵ سێشتدا پەیوەندیی بێ :ـ

یەکەم : بنێررێتە لای مامۆستاو مورشیدێك ، ئەمیش بۆ ئەمەیە کە لەسەرخواناسیی و دەروون پاکی ڕای‌بهێنێ ، چونکە بێ‌گومانم کە ئەگەر منالّ هات و چووی (مورشید)ێکی زانای تێگەیەشتوو لە ئیسلام ،وەکۆڵ نەدەر لە جیهاد و ، نەترس لـەبەردەم ستەمکارانا بکات ... بێ‌گومانم هات و چووی زانا و دانای ئاوا وا ئەکات بە منالّەکە ، کە خوێن و دەمار و ئێسك و پێستی ئیسلام بێت ، چونکە مورشیدە راستگۆکان ، وە زانا خواناسـەکان هەموو ئیش و کارێکیان تارنانی دوژمنان و کافران بووە ، وە هەروەها هەڵگری ئالای یەکیەتی و سەربەرزی ناو کۆمەڵ بوون ،وە هیچ کـات چـاویان نـەنووقاندووە لـە ناڕەوا و بەســەریا هــەنگاویان هەڵنەگرتووە ، وە زۆر بە وردی خزمەتی شەریعەتیان کردووە و گوێ رایەڵی قورئان و فەرمووەکانی پێغەمبەر بوون ، فەرموو .

ـبەیەکەوەـ گوێ بگـرین بۆ مورشیدی زانای خواناس (شێخ عەبدول قادری گەیلانیی) لە کتێبی « الفتح الربانی »ل٢٩ کـە هـاتووە و ئەڵێت(١) :

« هەر شتێك شەریعـەت پاڵپشتی نەکات . ئـەوە بـێ دینـی و سەرگەردانیە ، کەواتە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر ـ صلی الله علیـه وسلم ـ بکە بە باڵ و پێی هەڵفڕە بۆ لای هەق‌و راستیی ـکە خوایە ، جل جلاله ... » .

دیسانەوە زانا و مورشیدی خـواناس (ئـەبول حەسەنی شـاذلی) ئەفەرمێ : « هەرکات کەشف و کەرامەتت لەگەڵ قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرا ـ صلی الله علیـه وسلم ـ نـەگونجا ..!! ئەوە زۆر زۆر بـە

---

(١) زۆر بەداخەوە کە هەندێ نەفام‌و گزی‌کار ئـەم پیـاوە ناوازەیانە ـ تابتوانن ـ ناشیرین کردووە بۆ ئەوەی هەندێ شتی پروپووچو شیرك بدەنە پاڵی ئیسلام بە ناوی ئەوەوە .

توندی قورئان و فـەرموودەکـە بگرە و کـەشف و کەرامـەتە کـەت فرێ بدە ٠٠ ،

**(ئەبوو سەعیدی خەراز)**یش ئەفەرمێ : « هەر باطن و پـەنهانییەك رواڵەت و دیمەنەکـەی لەگـەڵ شەریعـەتا دەست نـەدات ٠٠!! ئـەوە پرووپووچ و ناڕەوایە ٠٠ ، ٠

بەڵێ ٠٠ مام عەلی ؛ مورشیدی راستەقینە هەڵگری ئاڵای جیهادە ، وەموصلیح و ڕێخـەری موسڵمانانە ٠٠ ئیمامی سـەنوسی کاتێ ویستێتی نێوان موسڵمانان بەهێز بکات ، واتـە یەکیـەتی بخـاتە ناویانەوە بۆ ئـەم مەبـەستە پـەلاماری ئەسـەر (تەصـەووف) داوە ،کۆمـەڵێ صۆفـی کۆ ئـەکردەوە و سـەدەهـا پرۆژەی خێری گشتی دروسـت ئـەکرد بـۆ موسڵمانان (نەك بۆ خۆی ٠٠!) ٠

بەکورتی

ڕێگەی تەصەووف گەورەترین و چاك ترینی ڕێگایە بۆ یەکیەتی و برایەتی و ئاشتی و لەناوبردنی کافر و دوژمنی قورئان ، بەمەرجێ لـە چەشنی ئەو مورشیدانە سەرپەرشتی بکەن کـە هەندێ وەسپمان کردن لەپێشەوە ، وە لەشێوەی ئەو خواناسانە بێت کە ڕێگەی جیهادو پاراستنی ئیسلامیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە وەك (عەبدوڵلای کوڕی موبارەك)(١) خوا لێی رازی بێت ـ ئەم زاتـە کاتـێ بیستی (فوضەیلی کوڕی عیاض) چۆتە حەرەمی مەککە و دەستی لە هەموو شتێ شۆریوە ، تەنها خەریکی عیبـادەتی خۆیـەتی ٠٠!! واتـە بێوەی دانیشتووە گۆشەنشین ٠٠! وە جیهادی خستۆتە ئەولاوە ، کاتێ ئەمەی بیست ، چونکە ـ ئەو خۆی ـ

(١) ئەم پێشەوا خواناسە مـاوەی تەمـەنی بۆ ئیسلام تێکۆشا و لـە (جیهادا) بوو ، تا ئەوەبوو لـە سالی ١٨١ ی کۆچییدا لـە (جیهاد) گەڕایەوە لە (هیت)ی عیراقدا کۆچی دوایی کرد ٠

زانایەکی تێگەیشتوو بوو لەئیسلام ، وەئەی زانی کـە ئیسلام پاسەوانی ئەویێ بەچەکەوە ٠٠ وەکافران ناترسن لەگۆشـە گیری و کەنار گرتن ـبەڵکو بە قازانجی ئەوان تـەواو ئـەبێت ، کاتێ ئەمـەی بیست گورج هـەڵسا (فوضـەیلی) خـەبـەر کردەوە و داوای لێکرد کـە غـەیری رێگە بگرێ ٠٠!!

چونکە پیـاوی زاناودانا ئابـەو جـۆرە گۆشـەنشین بێـت زیانـی گەورەی قورئانی تێدایە ، بۆیە بە هەندێ هۆنراوە ئاگاداری کرد ، ئیتر (فوضەیلیش) دەست بەجێ ئامۆژگارییەکـەی پەسـەند کرد و گریا و وتی راستی ووتووە ٠

یـاعـابد الحـرمین لـو أبصرتنـا
لعلمـت أنـك بالعبـادة تَلْعَبُ

او كـان يتعـب خيلـه في باطـل
فخيولنـا يـوم الكريهـة تتعـبُ

او كان يخضـب خـده بدموعـه
فنحـــورنا بدمائنـــا تتخضّـــبُ

ريح العبير لكم ونحن عبيرنا    رَهَج السنابك والغبار الأطيب

**مامعەلی : مامۆستا ؛ ئەی قوڕ بەسـەر ئێمـە ٠٠ پیاوێك بڕواتە** حەرەمی مەککە و تەنهـا خـەریکی خواناسین بێت ، ماستاو بۆ کـەس نەکات ، بەڵێ بۆ هیچ ستەمکارێك نەکات ، هۆنراوە و پەخشان بـەسەر کەسدا هـەڵنەدات کـەچی (عەبدوڵڵا) هێشتای رەخنـەی لێ بگرێ و بەکۆسپی دابنێ لە بەردەم قورئانا ٠٠!! ئاخۆ ئەگەر عەبدوڵڵا ـ بەلای چاوەوە ـ وەزعی موسڵمانانی ئـەمڕۆی بینیایـە ، بەتایبەتی مورشید و زاناکان ، چی بووتایە و چ شینێکی ئیسلامی بکردایە ٠٠؟!

**مامۆستا :** مام عەلی ؛ ئەویش هەرئـەوەی ئەفەرموو کـە ئیمـامی غەزالی لەکتێبی (احیاء علوم الدین) دا کـە هـەشت صەدە لەمەو پێش فەرموویەتی دەربارەیان •

**مامعەلی :** مامۆستا گیان ؛ بەئـەرکی مـەزانـە توزێ لـەوەم بۆ باس بکە •

**مامۆستا :** مام عەلی ؛ زیان بردنە سەر لەگەل ئەمیر و دەستەلاتدارە ستەمکارەکاندا سـێ جۆرە : یەکـەم ئەمـەیە ـ کە لەهـەموو بارەکان خرابترە ـ تۆ بڕۆی بۆ لای ئەوان ••!!

دووەم : ئەوەیە ئەوان بێن بۆلای تۆ •

سێهەم : کە پلەی بێوەیی‌یە ، ئەوەیە کەنار بگری ، واتە نە بی‌یان بینە ، وە نە ئەوانیش تۆ ببینن •

بەلگەمان بۆ بەشی یەکەم ـ تۆ بڕۆی بۆ لای ئەوان ـفەرموودە و وتەی پێشینانە ، ئیتر بێجگە لە پێغەمبەری خۆشەویستمان کە ئەفەرمێ :

**« ابغض القراء الی الله تعالی الذین یزورون الأمراء » •**

واتە خوا قینی هەرەگەورەی لەو قورئان خوێنانەیە کە ئەڕۆنەلای ئەمیر و کاربەدەستەکان ••!! دیسانەوە ئەفەرمێ :

**« خیر الأمراء الذین یاتون العلمـاء ، وشـر العلمـاء الذین یاتون الأمـراء » •**

واتـە باشترین کاربـەدەست ئـەوانـەیـانن هـات و چۆی لای زاناکان بکەن •

وە خراپترینی زاناکان ئەو دەستەیانەن هات و چۆی کاربەدەستەکان بکەن •وەیان ئەفەرمێ :

---

(١) بەرگی دووەم ص١٤٢ـ١٥٢ •

**« العلماء امناء الرسل على عباد الله مالم يخالطوا السلطان ٠٠ فاذا فعلوا ذلك فقد خانوا الرسل فاحذروهم واعتزلوهم » ٠**

واته زاناكان ئەمين و دەمڕاسی پێغەمبەرانن بەسەر بەندەكانی خواوە تاتێكەڵی دەسەلاتی دەسەلاتداران نەكەن ، جا هەر كات پاڵیان دا بە ئەمیر و كارگێڕە ستەمكارەكانەوە دیارە ئەوە خەیانەتیان لە پێغەمبەران كردووە ٠٠!! ئینجا ئێوەیش (ئەی موسڵمانان) دووره پەرێز بوەستن لێیان و كەناریان لێ بگرن ٠٠!!

مام عەلی : سەرگوزەشتە و داستانی پێشینان زۆر زۆرە ، بەلام بۆ ئەوەی لە مەبەستەكەی خۆمان زۆر لانەدەین (قنیات ـ اكتفاء) ئەكەین بە فەرموودەكانی حەزرەت ـ صلى الله عليه وسلم ـ سەبارەت بە بەشی یەكەم ، وە بۆ دوو بەشەكەی تر پێویست ناكات هیچیان لێ بڵێین ، چونكە زۆر دەگمەنن ٠

مام عەلی : وەك لەپێشەوە وتمان كاری مورشیدی راستەقینە بریتییە لە جیهادو بووژاندنەوەی خەڵكی بۆ تاراندن و راونانی كافران لەوڵاتی ئیسلام ـ وەك ئەم شۆڕشانە :

- شێخ سەعیدی كوردی نەقشبەندیی لە توركیا ٠
- شێخ شامل نەقشبەندی لە تركستان ٠
- سنوسیەكان[1] لەلیبیادا ، دژی (ئیتالیا)ی فاشیست ٠

بەكورتی :

ئەوانەی ناوێكی ئاینیان لە سەربووە خۆفرۆش نەبوون ، وەتا

(١) تەریقەی (سنووسی) لە لیبیادا ، قوتابخانەیەكی فێركردنی جیهاد بوو ، دژی ستەمكاران ٠٠ یەكێ لە پێشەواو (مورشید)ەكانی : مامۆستا ئەحمەد كوڕی محمدی سنووسیی بوو ، ئەم ناودارە (١١) یازدە ساڵی رەبەق لەگەڵ فەرەنسەدا جەنگاو كۆڵی نەدا ، واتە لە ساڵی ١٩٠٢ی زایینیەوەتا ١٩١٣ی زایینی ٠ ئیتر بێجگە لەوەی كە پتر لە (٧) ساڵ لەگەڵ (ئیتالیا) داجەنگا ٠

دوایین دڵۆپەی خوێن جەنگاون دژی زاڵمان و ستەمکارانی ئاین و وڵات خۆران وەك :

× عەبدول قادری جەزائیری[٢] ، دژی فەرەنسەی داگیرکەر و خوێن مژ .

× شۆڕشە ، ئیسلامیەکەی (هیند) ساڵی (١٨٥٧)ی زایینی دژی ئینگلیزەکان ، بەڵام داخەکەم بڕێ خۆفرۆش نەیانهێشت بگاتە بەرهەم، ئەوەبوو ئینگلیز چووە ناو شاری (دهلی) یەوە بەنامەرداەو سەربەرزی چڵکاوخۆرەکان (٣٠٠٠٠)سی هەزار لاوی موسڵمانی لە قەنارەدا ..!!

× پەلاماری زانا موسڵمانەکانی (ئەندەنووسیا) دژی داگیرکەری (هۆڵندە) بەڵێ ... تەصەووف و خواناسین هەموو کات چقڵی چاوی ستەمکاران بووە ؛ بەڵام بەداخەوە لەم دوادواییەدا ڕێگەی (تەصەووف) یان لێگۆڕین ، وەکردیان بەکۆمەڵ و دەستەیەکی جیاواز و دوور لە ئیسلام و بێخەبەر لە قورئان !! بەجۆرێك کە هەرکات باسی تەصەووف کرا خۆشاردنەوە و گۆشەگیری و

---

(٢) مامۆستا عەبدول قادریجە زایریی ساڵی (١٨١٧)ی زایینی لە (وەهران) لە دایك بووە ، وەدەستێکی باڵای بوونە (فیقهدا) بۆیە لە ناوەڕۆکی دڵی موسڵمانەکاندا جێگەی خۆی کردەوە ، بە تایبەت دوای داگیرکردنی (جەزایر) لە لایەن فەرەنسەی خوێن . مژەوە ئەوەبوو زاناو داناکان کۆبوونەوەو پەیمانیاندا بەیەکترکە بجەنگێنن دژی فەرەنسە ، بەسەرکردایەتی بەڕێزی ، .. بەڵێ (١٧) حەڤدە ساڵ شۆڕشی کردو فەرەنسەی هێنابە چۆکا ـ ئەگەر دەستی ناپاکان نەبوایە ـ لە وڵات ئەیکردە دەرەوە ، بەڵام داخەکەم ساڵی ١٨٤٧ گەمارۆ دراودیلکراو بردیان بۆ فەرەنسە ، ئینجا خۆیو خێزانی دوور خرانەوە بۆ (سووریە) تا ساڵی ١٨٨٣ ، وە هەرلەوێ کۆچی دوایی کرد ، وە لە ساڵی ١٩٦٧ داتەرمەکەیان گواستەوە بۆ جەزایر .

دوور کەوتنەوە لەجیهاد دێت بەبیر و مێشک ، لەمەیشەوە سەروازی بکرد و گەیشتە ئەورادەیە کـە بووترێ : « موسلمانی خـاوەن (سلوك) و پەروەردە نابێ تێکەلّیی سیاسەت بکا ..!! » یا « ئەگەر بەچاو شێخەکەت بینی خەریکی بێشەرعی بوو ئەبێ ـ ئەی ئەکی موریـد ـ بەعیادەتی بزانیت ! » ، چونکە تۆ چاوی بێنت کوێرە و لەوانەیە لە ژێرەوە حیکمەتێکی تیا بێت !!» ساخوایا بمان نێریتەوە بۆ لای (تەصەووف)ی راستەقینە و دروست .

**مامعەلی :** مامۆستا فەرمووت ؛ پێویستە منـاڵ لەگەڵ (سێ)شتدا ئاشنایی دابخات یەکێکیانت بۆ باس کردم ، پێم خۆشە ئـەوانیشم بۆ باس بکەیت .

**مامۆستا :** بەڵێ .. مام عەلی ؛ یەکەممان باس کرد و وتمان ئەبێ ئەومناڵە بنێررێتە لای زانا و مورشدێك ، ئێستایش گوێبگرە بۆ خاڵی دووەم و سێهەم .

دووەم : پەیوەندی مناڵ بەردفیق و هاوڕێی چاکەوە .

ئەبێ بەخێوکەر هەوڵ و کۆشش بدات تا لەجۆرو شێوەی خۆیان هاوڕێ و برادەریان بۆ هـەڵ بژێرێ ، بۆ گـەیشتن بـەم مەبەستەیش چوار شت پێویستە .

١ ـ پەیوەندی بە بنەماڵەوە ، واتە لەگەڵ براو خزم و کەس و کارادابهێنرێ ، چونکە کۆبوونەوە لەگەڵ ئەمانەدا ناچاری و سروشتییە، کەواتە پێویستە بۆ بـەخێوکەر دوور تا نزیك چـاودێری بکات و بزانێ ئەوانەی ئەم لەگەڵیانا هەڵس و کەوت ئەکات چۆنن ..! بێگومانم ئەگەر ئەوانە باش و رێك و پێك بن ئەمـانیش خووی ئـەوان ئـەگرن ، خۆ ئەگەر لار و لاساریش بن هەربەوجۆرە .

مام عەلی ؛ دیارە ئەم چاودێریە ئەزیەت و ماندوو بوون و سەرف و خەرجی ئەوێ ، هەروەك ئازار و بێزاری دڵ و دەروونی ئەوێ .

٢ ـ پەیوەندی بەمناڵی گەڕەکەوە ، دیسانەوە ئەم تێکەڵیەش سروشتیە و ئەبێ هەربێ .. کە وابوو لە خاڵی یەکەم پتر پێویستە چاودێری و ئاگاداری و سەرنج دانی هاوڕێ و برادەریان . واتە ئەبێ کام مناڵ ـ لەگەڕەکەکەدا ـ زیر و پەیوەندی بە ئاینەوە هەیە ئەوەیان هەڵبژێرێ و بیکا بە هاوڕێی .

٣ ـ پەیوەندی بەو منالانەوە خوویان داوەتە مزگەوت .. واتە لە گەڕەکەکەدا ئەو مناڵانەیان بۆ دیاری بکات کە هاتوچۆی مزگەوت ئەکەن بۆ (جومعە و جەماعەت) و دەرز خوێندن .

بەڵێ .. ئەرکی سەرشانی بەخێوکەرە ئە هیچ کات غافل نەبێ لە هەڵنان و هاندانی مناڵ بۆ مزگەوت ، بۆ ئەوەی لە وەختی خۆیدا ئامادەی نوێژبێ و بە جەماعەتیش بیکات ، وە بۆ ئەوەی بڕواتە ئەڵقەی قورئان خوێندنەوە .

٤ ـ پەیوەندی بە قوتابخانە و کارگەی پیشەوە .. واتە پێویستە چاودێری مناڵ بکرێ لە قوتابخانەدا ، چونکە زۆربەی قوتابخانەکان ـبەداخەوەـ بوونەتە مەڵبەند و هێلانەی ڕواندنی بیروباوەڕی کافران و ڕێبازی دوژمنانی خوا .

کەوابوو ئەو قوتابییە دڵ پاکانە نابێ بخرێنە ژێردەستی تاقمێك کەویژدانی خۆیانیان فرۆشتووە بە (شەیتان) وە دەروونیان ناوەتە دەستی بێگانەکان .

نابێ بخرێنە ژێر دەستی کۆمەڵێك کە ئەمبەرو ئەوبەریان تێکدانی مێشکی رۆڵەکانمانە سەبارەت بەئیسلام .

نابێ بخرێنە ژێر دەستی کەسانێکەوە کە ئاوات و نیازیان ناشیرنکردنی بەرنامەی ئیسلامە لەلایان .

**مام عەلی : بزانە چاودێری کردنی ئافرەت زیاتر پێویستە لە کور ،** چونکە ئافرەت دڵ نـەرمیەکی هەیـە زۆر زوو تێك ئـەچێ و جل و بەرگی شەرەف دائەماڵێ ..!!

خۆ ئەگەر ـ منالەکەت ـ لە فابریقەیـەك ئیشی ئەکرد ، دیسانەوە زیاتر چاودێری ئەوێ ، چونکە دەستی ناپاکەکان زیاتر جێگیر بووە ئەوە زۆر بەیان حەز بەزیانی ئاژەڵی و حـەیوانی ئەکەن وەهەموو ئاواتیکیان تێر کردنی هەڵپـەی (جسیەت)یانـە !! ئەمازە بەهورێ و برادەرە ئـەم فەرموودەی پێغەمبەرە ـ صلی الله علیه وسلم ـ کەئەفەرمێ :

**( المرء على دين خليله ، فلينظر احدكم من يخالل ؟!! ) .**

سێهەم : بانگ کردن بۆ لای ئیسلام ...

بەڵێ .. بۆ ئەوەی هەر بەمنالی خووی بداتێ و بیکات بە پیشە و کاری ڕۆژانە و پاشە ڕۆژی ، وە بۆ ئەوەی لە دوا ڕۆژا لە هیچ کوسپێك سل نەکاتەوە ئەم خالە پێویستە بەم شێوەیەی خوارەوە :

١ ـ لە رووی نـەفسی و دەروونییەوە ئامادە بکـرێ .. واتـە تێ بگەیەنرێ کـە لـە دێرین ڕۆژگارەوە تائیستا موسڵمان و کافر هـەر لەناکۆکی و زۆران بازیدا بوون ..!

٢ ـ هەوڵ و تێکۆشـەنەکەی تەنها لەبـەر بـەرز بوونەوەی ئاڵای ئیسلام بێت ؛ وەهەروەها هیوا و ئاواتی سەرکەوتن بخاتە پێش چاوی ، بەرە و فیداکاری قوربانی دان هەڵیبنێت ، وە ڕوودا وە مێژوو یەکانی بۆ بـاس بکات وەك :ـ

- کێ بەدڵیا ئەهات جارێکی‌تر ئیسلام هەڵسێتەوە دوای ئەوە عەرەبەکان دەمارگیریـەتی و رەگـەز پەرستیان هـەڵیدایـەوە دوای کۆچی پێغەمبەر ـ صلی الله علیـە وسلم ـ کەچی ئەوەبوو بـە هـەوڵ و

تێکۆشانی خوانساں دیسانــەوە ڕەوڕەوەی ژیانیان بەرەو ئیســلام هێنایەوە ••دوای تەواو مەئیوس بوون !

تەنانــەت بەخەلیفــەی موسڵمانــەکانیان ـ ئەبووبەکر ـ ئــەوت : « تۆ بەرگەی جەنگی عەرەبەکان ناگریی •• بڕۆ لەماڵەوە داکەوە و دەرگا لە خۆت قایم کەو خــەریکی زیکر و ئــەورادی خۆتبــە تا ئەمریت ••!! » •

- کێ بەتەمای رزگار بوونی (قدس) بوو دوای داگیرکردنی لەلایەن صەلیبیەکان وە ؟!

- کێ بە هیوای ئەوە بوو کــە خوا پاڵەوانێکی دلێر و جــەنگاوەری ڕەسەن کوردی بۆ بنێرێ ، وەك (صەلاحەددین)ی ئەیووبی کــە خاچە داگیرکەرەکان تارنێ ؟!

چوارەم : یاساو مەرجەکانی بلاوکردنــەوەی بــەرنامەی خوای تێ بگەیەنرێ بەم شێوەیە :

أ ـ هەربڕیارێك باسی ئەکات ، پێویستە خۆی لــە پێشەوە ئگــاداری حوکم و بڕیارەکــەی بێت لە شــەریعەتی ئیسلامدا واتــە کوێرانە مل نەنێت •

ب ـ وتەو کرداری یەکبن ، تاخەڵکی قسەکــەی لێ وەرگرن ، وەبێن بەسەردەم بانگەکەیەوە ، ئای چ دەردێکی کوشندەیە وتەو کردار وەك یەك نەبن !!•

ج ـ لەسەرخۆ ئەو کارە ناپەسەندەیــە بگۆڕێ ، یەکەمجــار ترسی خوا بخاتە دڵیەوە ، خۆ ئەگەر سوودی نەبوو هــەرەشەی لێ بکات ، ئینجا بەزمان ، ئینجا بەدەست هەر بەو جۆرە •

د ـ زمانی شیرین و قسەی نەرم و نیان بێت ، وە زۆر بە حیکمەت و هێمنی بجووڵێتەوە •

هـ ـ بەئارام و خۆگر بێت ، لەسەر سزا و ئەشکەنجەی زاڵمان و ناپاکان •

و ـ چاودێریی بکات بۆئەوەی بزانێ هەستان و دانیشتنی چۆنە لەگەڵ ئیشەکەیدا •

**مامعەلی :** مامۆستا ؛ ڕای ئیسلام چییە سەبارەت بە (وەرزش) بە هەموو جۆرەکانیەوە ••؟ ئەم پرسیارەیشم بۆ ئەوەیە هەندێ لەمس وائەزانن موسلمان و ئەوەی موسلمان ئەبێ تەپ و جم نەکات !!•

**مامۆستا :** مام عەلی ؛ بەڕاستی منیش پرسیارە کەتم بەدڵە ، چونکە پەیوەندی هەیە بە پێگەیاندن و پەروەردەی منالەوە ، واتەی باسە کەی خۆمان •

بەڵێ •• ئیسلام داوا ئەکات کەنرخی کات بزانین و بەفیڕۆ بەسەری نەبەین جالەبەر ئەوە شەریعەتی ئیسلام رای وایە ئەو بۆشاییانە بەجیهادو مەشقی سەربازیی و خۆراهێنان لەسەر جۆرەکانی وەرزش پڕبکەینەوە • کەوابوو باهەر یەکەمجار منالە خنجیلانە دڵ پاکەکانمان رابهێنین لەسەر مەشقی سەربازیی و جۆرەکانی وەرزش ، چونکە وەرزش ئەبێتەهۆی :

- لەش ساغی و تەندروستیی •
- راهاتن لەسەر پێویستیەکانی جەنگیی • جابەم هۆیەوە فەرموو تۆو باقەیەك لەفەرموودەکانی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ بۆ پشتگیری ئەممەبەستە :

« المؤمن القوي خير وأحبُّ الى الله من المؤمن الضّعيف » موسليم •

« كل شيء ليس من ذكر الله فهو لهو أو سهو الا أربع خصال : مشى الرجل بين الفرضين [للرمي] ، وتأديبه فرسه ، وملاعبته أهله ، وتعليمه السباحة » •

**« إرموا بني اسماعيل ، فان أباكم كان رامياً ‥ إرموا وأنا معكم كلكم » بوخاري .**

بەکورتیی :

ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەرشتێك هۆی نەشوونیمای لاشە و رۆحی ئادەمیزاد بێ پەسەندی کردووە ، هەروەك پەسەندیشی کردووە هەڵیشمان ئەنێت بۆ فێر بوونی ‥ چونکە ئەگەر ئێمە ئابەو جۆرە ئامادە و لێهاتوو بین ‥

شارەزای جیهاد و مەشقی سەربازیی بین ، ئیتر کافران چاو ئەبڕنە بەرووبوومی وڵاتی ئیسلام و ژێردەستیان نابین .

بەڵام پێویستە چەند حاڵێك بگرینە بەر بۆ ئەوەی لە سنووری خۆی دەرنەچێ .

یەکەم : کاتێکی گونجاو و هەڵبژێری بۆی ، واتە هەمووکات خۆی پێوە خەریك نەکات ‥ چونکە زیانی لارەسەنگ ئەبێت ئەمەیش لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێت بۆیە پێغەمبەرمان محمد – صلى الله عليه وسلم – ئەفەرمێ :

**« يا عبدالله بن عمرو : إن لله عليك حقاً ، وإن لبدنك عليك حقاً ، وإن لأهلك عليك حقاً ‥ فأعط كل ذي حقٍ حقه ‥» .**

دووەم : سنووری خوا پێش چاوبگیرێ بەم جۆرە :

أ – ئەو جل و بەرگەی وەرزشی پێوە ئەکات ‥ یامەشقی سەربازیی ئەبێ لە ناوکیەوە تائەژنوێ داپۆشێ .

ب – لە شوێنێکا بێت شەریعەتی ئیسلام یاساغی نەکردبێت ، کەواتە ئەوەکو ئافرەتان بووەستن و کوڕان یاریی بکەن ، وەیا کچ و کوڕ بەیەکەوە مەلە بکەن !!.

وەیا هەرکردەوەیەکی تر کە بێتەهۆی خەشم و قینی خوا دیارە ئەوە ناپەسەندە .

ج - نابێ بەخشش (جائزە)کە لە سەرشتێکی حەرام بێت ، بەم شێوەیە پەسەندە کەئەبێ هەر لایەکیان بەخششی بۆ دیاری بکرێ ، واتە نابێ هەردوولایان بەلێن بدەن بە یەکتر ؛ چونکە ئەوە قومارە .

بەلام ئەگەر لایەنی سێهەم بۆیان بڕیار بدات ئەوە قەیناکات .

سێهەم : مەبەست و نیازی لەگەل خوادا ڕێك و پێك بکات .

واتە مەبەستی لەم مەشق و ڕاهێنانە لەسەر وەرزش خۆ ئامادەکردن بێت بۆ تارناتی کافران و فیداکاری و قوربانی و تێکوشەن لە پێناوی ئیسلاما .

**مام عەلی :** بەراستی ئەگەر بەو جۆرە منال بەخێو بکرێ ئەوە مانای وایە هەموو موسلمانێ هەلساوە بەئەرکی سەرشانی خۆی و سەربازێکی خنجیلەشی پێشکەشی ئیسلام کردووە ، وە هەموو جم و جوولێکی منالەکەیش بەخوا پەرستیی دائەنرێ بۆیە کۆڕی زانایان فەرموویانە :

« **إنّ النية الصالحة تقلب العادة عبادة** » .

« **وقل اعملوا فسيرى الله عملكم ورسوله والمؤمنون** » .

**صدق الله العظيم**

# دیمەنی حەوتەم

[ مامۆستا ڕۆژێ لە ژوورەکەی دانیشتنی خۆیدا لە مزگەوت بەتەنها دانیشتبوو خەریکی موتاڵەی تەفسیری سوورەی (التوبة) بوو ـ کە بەراستیی سوورەتێکە پێویستە هەموو موسڵمانێك لەبەری بێت بەمانەکەیەوە، چونکە ئادەمیزاد تێ ئەگەیەنێ کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام چەندە ئازادی و سەربەستیی دراوەتێ بۆ بەرگری لە ئاین ، وە بۆ جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی هێمنی و ئاسایشدا •• هەروەك دەستوور و یاسایەکی جەنگ و ئاشتی ئەخاتە پێش چاو •

بەڵێ •• دیسانەوە مام عەلی وەك موسڵمانێکی دڵسۆز بە کۆمەڵی موسڵمان هاتەوە بۆ لای مامۆستا ] •

**مامعەلی :** **مامۆستا گیان ؛ خوا لە نیعمەت نەسێنێ و پاداشت بەچاکە** بداتەوە ، ئەوەبوو لە دانیشتنەکانی پێشوومانا باسی ئەوشتانەت بۆ کردین کە پێویستە منداڵیان لەسەر پەروەردە بکرێ ••جا ئەگەر ماوەت هەبێ ئەمڕۆش ئەمەوێ باسی ئەو شتانەم بۆ بکەیت کە پێویستە منداڵیان لێ دوور بخرێتەوە •

**مامۆستا :** **مام عەلی ؛ پێش ئەوە لەم باسە بدوێین دوو شت پێویستە :**

یەکەم : پەیوەندی خۆشەویستی قورئان لەدڵی منداڵەکەدا بڕۆینرێ • بۆ ئەوەی بەرگری وەرگرێ و خۆی لە هەموو خوویەکی نابەسەند بپارێزێ •

دووەم : ئەبێ بە (خێوکەر) خۆی بڕازێنێتەوە بە ڕەوشتی بەرز و پاك ، تەنانەت ئەو شتانەیش کە بەتەنها دیمەن پڕوپووچن ئەبێ خۆی لێیان دوور بخاتەوە ، چونکە پەروەردەکەر هەمیشە چاو لێکراوە و

نەخشە بۆ خێزانێك ئەكێشێ ، ئینجا سەرەی مناڵەكە دێت بەم شێوەی خوارەوە :

١ ـ خۆ پاراستن لەو شتانەی ئەبنە هۆی پشگەز بوونەوە لە ئیسلام ، واتە كافر بوون « ردة » ئەمەیش چەند رووبەكی هەیە وە ئەبێ هەوڵ و تێكۆشانەكەی بەدروشم و نیشانەیەك بێت وانیشان بدات و خەڵك وای لێ تێ بگات كە بێجگە لە ئیسلام مەبەست و نیازێكی تری نیە وەك :

أ ـ هەوڵ دانەكەی بەناوی «قەومییەتە»وە بێت واتە بۆ ئەوەبێت ئالآی قەومییەت بەرز بكاتەوە ..! چونكە پێشەواامان حەزرەتی محمد ـ صلى الله علیه وسلم ـ بە نەفامی و رەگەز پەرستیی ناوی بردووە وەك ئەفەرمێ :

**« لیس منّا من دعا الی عصبیة ، ولیس منا من قاتل علی عصبیة ، ولیس منا من مات علی عصبیة » .**

ئەبوداود گێراویەتەوە.

ب ـ تێكۆشانەكەی لەبەر نیشتمن بێت ..!! واتە ئیسلام نەگرێتە پێش چاو ..وە لە ژێر ئالآی ئیسلاما داوای نەكات .

خۆ ئەگەر هەوڵ و تێكوشانەكەی لە چوار چێوەی ئیسلام دەرنەچوو ئەوە ئیسلام پەسەندی ئەكات و بەلایەوە بەجێیە .. نە هەرئەوە بەڵكو هانیشمان ئەدات كە شەرەف و ئایین و ماڵ و سامان و ولآتمان بپارێزین و نەهێڵین زالم و ستەمكار دەستی تێكیشێ . سەرەڕای ئەوەیش هەركەسێك لەو رێگەدا بمرێ و تیا بچێت ئیسلام بەشەهیدی راستەقینە ناوی ئەبات و پلەی شەهادەتی داوەتێ وەك پێغەمبەرمان ئەفەرمێ :

**« من قتل دون ماله فهو شهید ، ومن قتل دون دمه فهو شهید » .**

بێجگە لەمەیش پێغەمبەر ـ صلى الله علیه وسلم ـ لە فەرموودەیەكیا

ئەفەرمێ : « باشتیرینتان ئەو کەسەتانە لە پێناوی عێلەکەی خۆیدا تێ‌بکۆشێ ...، بەو مەرجە تووشی گوناهو تاوان نەبێت » :

« خيركم المدافع عن عشيرته مالم يأثم(١) » .

ج ــ تێکۆشانەکەی مرۆڤایەتی پێی بکات .. واتە بەدڵیا نەبێت کە خوا فەرمانی بەسەرا داوە کە هەوڵ بدات بۆ رزگاری دانیشتوانی سەرزەوی ، بەڵکو هەر مرۆڤایەتی پێی بکات ــ وەك هەندێ کەس ئەڵێن ــ دیسانەوە ئەمە ناپەسەندە ، چونکە ئەم جۆرە هەوڵدانە دروشمی (ماسۆنییەتە) کە سەهیۆنییەتی جیهانی ئەیبات بەڕێوە .

بەکورتی :

هەر ڕژێم و دروشمێك هەوڵ و تەقەلای بۆ بدرێ ،وە ڕەزامەندی خوای تیانەبێت ..!! ئیتر هەر شتێك بێت ــ ئەوە دروشمی نەفامیەتە :ــ

× خۆشەویستی و گوێ ڕایەڵی و مافی بڕیاردان بۆ غەیری خوا (اعطاء الولاء والمحبة والحاكمية والطاعة لغير الله) .

وەك ئەم کۆمەڵە ئایەتەیش تێمان ئەگەیەنن کە تەنها خوا مافی بڕیاردانی بۆ هەیە ، وەهەر کەسێك داوای یاسا دانان بکات ئەوە بەکافر دائەنرێت :

« ومن لم يحكم بما انزل الله فاولئك هم الكافرون » المائدة\٤٤ .

« ثم جعلناك على شريعة من الامر فاتبعها ولا تتبع اهواء الذين لا يعلمون » الجاثية/١٨ .

« يا ايها الذين آمنوا لا تتخذوا اليهود والنصارى اولياء بعضهم اولياء بعض ومن يتولهم منكم فانه منهم ان الله لا يهدي القوم الظالمين » المائدة/٥١ .

« يا ايها الذين آمنوا لا تتخذوا آباءكم واخوانكم اولياء ان استحبوا الكفر على الايمان ومن يتولهم منكم فاولئك هم الظالمون » التوبة\٢٣ .

---

(١) لەسراقەی کوڕی مالیکەوە .

× بڕیارێك له بڕیارەكانی خوا بداته دواوه ، واته بلێ بەكەڵك نایێت، وەك ئەوه كەبلێ ، ڕۆژووم پێناخۆشه ، چونكه زیان بەخشه بەیاسای ئابووریی ..!!
خۆ داپۆشینی ئافرەتم ناوێ .. چونكه نیشانەی دواكەوتنه !!

× به چاوی سووكەوه تەماشای عیادەتەكانی ئیسلام بكات ..!!

× باوەڕی بەهەندێكی ئیسلام بێت و .. باوەڕی بەهەندێی نەبێ ..!! بەم چەشنه بڕوای بێ كه ئیسلام ئایینی خوایه ڕستییه بەڵام بڕوای نەبێت بەوه كه یاساورژێمیشه ، یابڕوای بێت كه ئایینێكی ڕۆحی و ڕەوشتییه بەڵام بڕوای نەبێت كه ڕژێمێكی ئابووریی ،وه یاڕامیارییه !!

× بڕوای بەكردارو وتەو هەڵس و كەوتی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ نەبێت ..!

× بڕوای وابێت كه قورئان زاهیر و ڕواڵەتی هەیه و جیاوازه لەگەڵ نهێنی و (باطنیه) كەیدا ..! هەندێكی تایبەتی نەبێت كەس لێی تێ ناگات !!

٢ ـ دوور خستنەوه و پاراستنیەتی لەو جۆره یاری و گاڵتانەی كه شەریعەتی ئیسلام به ناڕەوای داناون .

**مامعەلی :** مامۆستا گیان ؛ ئەو یاریانه كه ئایینی ئیسلام یاساغی كردوون كامانەن ..؟

**مامۆستا :** مام عەلی ؛ پێش هەموو شتێك بزانه كه ئایینی ئیسلام ئەو شتانەی قەدەغه كردووه كه زیان بەخشن بەگرۆی ئادەمیزاد ، بەرەوشتیان ، به ئابووریان ، به قەوارەی دەوڵەت .. بەرێزی كۆمەڵ ..تاك ..خێزان ..بۆیه ئەم یاریانەی یاساغ كردووه كه ئێستا بۆت باس ئەكەم ..

**یەکەم : یاری (تاوڵە) :**

ئەم یارییە قەدەغەیە با بۆ بێتاقەتیش بێت پێغەمبەرمان ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەفەرمێ :

**« من لعب بالنرد فقد عصى الله ورسوله » .**

**مامعەلی :** ماەۆستا ؛ ئاخۆ ئەم یارییە بۆ حەرام بێت ..؟

**ماەۆستا :** مام عەلی ؛ چونکە کاتێکی زۆری یاریکەر ئەکوژێ ، وە زۆر جار دەست لە پێویستیپانی ئاینی هەڵئەگرێ ، بێجگە لەمەیش وردە وردە تەماع ئەیگرێ و لەسەرشت ئەیکات ، ئاوای لێ دێت ئەبێ بەجەردەیەکی ئاشکرای ناوکۆمەڵ ، خۆ موسڵمانیش بۆ ئەمە دروست نەکراوە ... بەڵکو بۆ ئەوەیە کە بەبێ وچان بەرنامەی ئیسلام بگەیەنێتە ناو کۆمەڵ ، دەخۆت حەکەم بە ، ئایا موسڵمان ئەوەندە کاتی هەیە تایاری پێ بکات و لەشتی حەراما بیباتەسەر ؟! ئای چەندە جوانە ئەو وتەیە کە ئەڵێت :

**« الواجبات أكثر من الأوقات » واتە پێویستەکانی ئاینی ، زیاترن لە کاتەکان ، با ئەڵێت :**

**« الوقت كالسيف إن لم تقطعه قطعك » .**

**واتە کات وەك شیر وایە ، ئەگەر وریای نەبیت و نەپارێزی ئەتبڕێ .**

**دووەم : گوێ گرتن بۆ گۆرانی و مۆسیقا ..**

کورتەی ئەم باسە بەم جۆرەیە : هەر گۆرانیەك باسی عەرەق و بیرە و تاریف و وەسفی ئەوانە بکات ، وەیا وەسفی ئافرەتێکی زیندووی دیاری بکات ..! وەیا ئافرەت بیڵێ و پیاوگوێی بۆبگرێ ، وەیا هێرش بێت بۆ سەر دەروونی موسڵمانێك ..

یا •• یا •• ئەوە حەرام و قەدەغەیە و ئەبێ خۆمان و مڵ و منداڵمانی لێ دووربخەینەوە ، جا ئەگەر بەو چەشنە نەبوو ئەوە پەسەندە و قەیناکات •

بەڕێز مامۆستا مەلا عەبدول کەریمی (مودەرریس) ئەڵێت :

هەروەها هەموو بەشی گۆرانی
دووربن لەڕەسم و شێوەی شەیتانی

چەن خۆشە بەستەی (لاوك) و (حەیران)
(ئای ئای) و (قەتار) نەغمەی گەرمیان

نەزمی ( دەرەیی ) و ( سیاچەمانە )
دڵ ئەبزێنێ لەو هەورامانە

( هۆرە ) و ( یاغەزال ) یا خاڵۆی ڕێبوار
( غەریب هۆ غەریب ) دەرد ئەکا تیمار

بەڵێ •• هەندێ گۆرانی چۆن قەدەغە نەبێت ••؟! تەماشا ئەکەیت ئافرەتی بێ ئابڕووە سووڕی ئەدات ، یاگۆرانی بێژی نەفامە بالۆرە هەڵ ئەدات بەعەرەقدا ••

هۆنراوەی یا هەڵ ئەدات • ژن و پیاو بەتێکەڵ هەڵپەڕکێ و سووڕدانە ، واتە خراپتر لە ڕەش بەڵەك •

مۆسیقایش ئەگەر بەو جۆرە بێت کە نەغمەکەی لەسەرپێت بێت ئەوە پەسەندە :

بۆ بانگ کردنی سەربازی سوپا
بۆ ئامادە بوون بۆ شەڕو دەعوا

بۆ دیداری شاو بۆ کاتی شادی
بۆ ولات گرتن لە بۆ ئازادی

ئینجا ئەو جۆرە مۆسیقانە کە ئێستا باون ـ وە ئەمانەی خوارەوە هەندێکیانن ـ حەرامن ، وەك بەڕێز مامۆستا مەلا عەبدول کەریمی (مدرس) بڕێکیانی باسکردون بە هۆنراوە لە « دووڕشتە » کەیدا .

( لهو غەفلەتە و غەفلەت حەرامە
گەپ و گاڵتەی زۆر دەستووری عامە

ئەسباب گەلێکن بەیاسای وولات
هەندێ لەوانە بەیانکەم لەلات

( ارغُن ، دربکة ، بوق ، ورکنارة )
( کمنجە ، قانون ، عود ) و ( نقارة )

(مجوز) و (صرنا) و (مزمار) و (طارە)
(صنج) و (طنبور) و (کوبە) و (قیشارە)

( دربکە ) وێنەی دیلەکی درێژ
( بوق ) بۆریەکە قەمچ و پێچ و لێژ

( مجوز ) دووزەلە ( صرنا ) سووڕنایە
( مزمار ) یەك خانە ( طارە ) وەك تایە

( صنج ) دوودەوری زەردی مەشهورە
( طنبور ) و ( رُباب ) مەعنای تەموورە

( کوبە ) دەملەکە هەموو حەرامن
ئیشی ئینسانی بێ دین و فامن

کەسێ بەشدار بێ لەپێشەی مەردی
ناکەوێتە سەر شێوەی نامەردی

وە هەروەها (جنك) و (سنطیر) و (کمان) و (ئۆکۆردیۆن) و (نای) و (پیانۆ) و (سکسیە) و (هلیکون) و (ماندولینە) و (ئۆکارینا) و

ئەوانەی تر کە هەن ئەمڕۆ لەناو دەوڵەتانا ، ئەمانــە هــەر هــەموویان حــەرامن چونکــە هۆن بۆ مراندنــی دڵو دوورخستنەوەی لــە یاســای خواناسان[1] .

ربنا لا تزغ قلوبنــا بعد اذ هديتنــا وهب لنــا من لدنــك رحمــة إنك أنت الوهاب .

**مامعەلی :** مامۆستا ؛ تەماشا کردن و بینینی (سینەما) و (تەلەفزیۆن) چۆنە ..؟!

**مامۆستا :** مام عەلی ؛ زۆر باش بوو بیرت خستمەوە ، هەرچــەندە لەپێشەوە تۆزێ لێیان دواین ـ چونکە ئەمە خاڵی سێهەمە لەو شتانە کە پێویستە مناڵیان لێ دوور بخرێتەوە ..

بەڵێ .. ڕاگرتنی (تەلەفزیون) و تەماشاکردنەوو گوێ گــرتن بۆ پرۆگرامەکانی گوناهە و تاوانە لای خوای گەورە ، وە هەروەها سەردان لە (سینەماکان و شــەوە پەمەییەکان ـ الليالي الحمراء)یش‌لای خوا زۆر تاوانترە ، نامانەوێ بەڵگە بۆ ئەم وشانە بێنینەوە چونکە هەرکەس تۆزێ لە خووڕەوشت بەشدار بێت ددانی پیادا ئەنێت و ئەیسەلمێنێ (من وقع في الشبهات ، وقع في الحرام) .

**مامعەلی :** من لەبەر (قورئان) خوێندنەکەی (تەلەفزیۆن)م‌ئــەوێ ، وەیا بەیناو بەین ڕاڤەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ئەکات ـ صلى الله عليه وسلم ـ ،وەیا زانیاری‌یەکی بەکەڵك پێشکەش ئەکات ، مامۆستا ؛ بەم نیازەیشەوە هەرتاوانبار ئەبم ..؟

**مامۆستا :** مام علی ؛ قورئان ئــەبێ لــەشــوێن و کاتێکی باشــا بخوێنرێ ! بێجگە لەمەیش لەو بڕوادانیم تەنها بۆ قورئان بکرێتەوە واتە گوێ بەبەرنامەکانی تری نەدرێت ، چونکــە ئەوەی ئامێری تەلەفزیون

---

(۱) بۆ باسی گۆرانی و موسیقا زیاتر تــەماشای (الحلال والحــرام في الاسلام)ی یوسف القرضاوي بکە .

ئەکاتەوە قابیل نییە هەرئەبێ تـەماشای هـەموو بەرنامەکانی بکات لە (ئەلفەوە تایێ) چونکە شەیتان هەڵی ئەنێت و پێی ئەڵێت ئەمەیان خۆشترە لەوی تریان تائەیخاتە نیوەشەو ، خۆ ئەگـەر توانی تا خۆی لەماڵـەوەیە لەکاتی هەندێ بەرنامەدا بیکوژێنێتەوە ئایا خۆی لەماڵ نەبێت منالەکانیشی وازئەکەن ••؟!

سەرەڕای ئەمانەیش وا ئەبێ (باوك) پەلامار ئەبات بۆ کوژانەوەی ئەچی خێزانەکەی ، یان میوانەکەی ناهێلێ ، خۆ ئەگەر هەر بێ دڵیان بـکات نابوتی و ناراوە ئـەکـەوێتە ناو خێزانەکـەوە •• بچووکترین دەرەست پەیدا نەبێت (تەلاقدانی دایکی منالەکانە ••!) •

مامعەلی : مـامۆستا : شتێکـی ترهـەیـە ، ئێمـە دراوسێکانمـان تەلەفزیۆنیان هەیـە ئەوـەر ئێمـە نەیکـەینەوە منالەکانمان مالـە و مـال ئەسوڕێنەوە و ئەوانیش وەرس ئەکەن •! بێجگە لەوەیش لـە (غەیبەت) مان ئەخات ! کەواتە لە لەناوبردنی یەکتر باشترە ••!

مامۆستا : مام عەلی ؛ باتۆیش و هەموو موسلمانێکی تریش بزانێ کە دروست نییە « شتی ناپەسەند بگۆڕرێ بەشتێکی تری ناپەسـەند •• المنكر لايزال بمنكر آخر يقوم مقامه » چونکە غەیبەت کردن حەرامە ، وەهەروەها تەماشا کردنی فلیمەکانیش حەرامە دەی کەواتە دروست نییە شتێکیـان بگۆڕێ بـە شتێکـی تریـان ، ئیتر بازیانـەکانـی تەلـەفزیۆن بووەستن وەك :ـ

١ ـ چاو بێهێز ئەکات •

٢ ـ زیانی دەروونی ، واتـەبێت لاوێـك ئافرەتێ ئـەبینێ و دڵی ڕائەکێشێ و لە ئەنجاما تووشی نەخۆشی دەماری و دەروونی ئەبێت •

٣ ـ زیانی ناو خێزان •• وا ئەبێ چەندەها ئیشی باشیان لـەدەست ئەدات بچووکەیان ئەوەیە منالەکان لەقوتابخانە دەرناچن •

٤ ـ زیانی ئابووری ‎٠٠‎ وائەبێ (پێشین ـ سلفه) ئەکات ، یا قەرز لەم و لەو ، یاشتێکی ناو ماڵی بۆ ئەفرۆشێ ‎٠٠‎!!

مام عەلی ؛ قوماریش یەکێکە لەو خووە زیانەوانەی کە ئەبێ منالی لێ دوور بخرێتەوە چونکە :

- مرۆڤ تەمەڵ ئەکات و بەتەمای زیان ئەبێت بە رێکەوتی (رێکەوت) !!٠
- ئامێرە بۆ وێرانکردنی ماڵ و چۆڵکردنی لیرەن و ریسوا بووی ناو کۆمەڵ ‎٠٠‎: زۆر بیستراوە (فلانی قومار باز) دەربەدەر بووەو خەڵکی سوالی داوەتێ ‎٠٠‎!!
- دوژمنایەتی پەیدا ئەکات لەناو برادەران و دۆستاندا ٠
- قومار کەر کە هیچی بەدەستەوە نەما هەوڵ ئەدات بۆ بە دەست خستنی زێڕ و زیو بەهەر جۆر دەستی کەوێ ‎٠٠‎! بەدزیی ‎٠٠‎ بە فڕاندن ‎٠٠‎!

دیسانەوە دووریش نیە بۆ ئەوانەی مرخیان ئەپەڕێتە سەر (سفرەی سەوز ـ المائدة الخضراء) ـ وەك خۆیان ئەڵێن ـ ئایین و نیشتمن و هەموو جۆرە شتێکی بۆ بفرۆشن ‎٠٠‎!!

- سەرەڕای ئەمانەیش بێ ئەمری خوایە و بەرگری ئادەمیزاد ئەکات لەیادی خوا ٠

**مامعەلی :** مامۆستا ؛ ئەی کڕینی کاغەزی (یانصیب) قومارە ‎٠٠‎ یا نە؛ ‎٠٠‎؟!

**مامۆستا :** مام عەلی ؛ خوا عەفووت کات ـ هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان قومار و کاغەزی یانصیبدا چونکە هەردوکیان هۆی تەمەڵی و

تەوەزلی و چاوبرینە لە سامانی خەڵك و ئەیەوێ بەو جۆرە بژی !
ئیسلامیش ئەیەوێ مرۆڤ وەك شێر وابێت و پەلامار بداتە ئیش و کار بەرەنجەشانی خۆی بژیی :

« **يا أيها الذين آمنوا انما الخمر والميسر والانصاب والأزلام رجس من عمل الشيطان فاجتنبوه لعلكم تفلحون ، انما يريد الشيطان أن يوقع بينكم العداوة والبغضاء في الخمر والميسر ويصدكم عن ذكر الله وعن الصلاة فهل انتم منتهون** •• » **(المائدة : ٩٠ـ٩١)** •

**مامعەلی :** مامۆستا : ئیسلام هەروەك ئەو جۆرە شتانەی یاساغ کردووە لە کۆمەڵ ئایا مۆلەتی شتی تری نەداون بۆ ئەوەی حویانی پێ رابهێنن بۆ پاشەڕۆژ و بەهێزبوونی لەش و دەروونیان ؟!

**مامۆستا :** مام عەلی •• کاتێ ئیسلام ئەو جۆرە کردەوانەی قەدەغە کرد ـ لەبەر زیانی رەوشتیی و کومەلایەتیی و ئابووریی و تەندروستیی لەشیی و دەروونیی ـ لە بەرامبەر ئەوانەوە چەندەها شتی داناوە بۆ ئەوەی بەکاریان بێنین تابینە رۆڵەی پاشەرۆژ و لە سێبری ئیسلاما بەرکەبگرین ••

لەگەڵ ئەمەیشدا خەلیفەی چوارەم ( عەلی کوڕی ئەبووطالیب ) ئەفەرمێ :

« إن القلوب تمل كل تمل الأبدان ، فابتغوا لها طرائف الحكمة »
یا ئەفەرمێ :

« روحوا القلب ساعة بعد ساعة فان القلب اذا اكره عمی •• »

واتە : دڵیش پێویستی بەحەسانەوە و پشوودان هەیە ، کەوابوو جارە و جار پشووی دڵ بدەن بەشتی جوان و پاك و خاوێن ••!

ئینجا ـ مام عەلی ـ فەرموو تۆ و هەندێ لەو یاریانەی ئیسلام ددانی پیا داناون :

أ ـ كێ بەركێ (مسابقە العَدْو) واتە راكردن بەپێ ، یا بە وڵاغ ، یا بە ئۆتۆمبێل •• پێغەمبەر ـ صلی اللە علیە وسلم ـ لەگەڵ عایشەی خێزانیا رای ئەكرد ••

ب ـ زۆران بازی (المصارعة)ئەوە بوو پێغەمبەر محمد ـ صلی اللە علیە وسلم ـ لەگەڵ (روكانە)دا زۆرانی گرت و خستی •

ج ـ یاری كردن بەهەموو جۆرە چەكێك •• واتە نیشانە شكێنێ ، بەڵام لێرەدا پێویستە ئەمە بزانرێ كە دروست نیە هیچ گیان لەبەرێك بكرێ بە نیشانەو گوللەی لێ بتەقێنرێ وەیا بەردی تێ بگیرێ !! (قال ابن عمر ان النبي ـ صلی اللە علیە وسلم ـ لعن من اتخذ شیئاً فیە الروح غرضاً) •

وە هەروەها نابێ هانی گیان لەبەرێك بدرێت لەگیان لەبەرێكی تر ، واتە شەڕە كەڵەشێر ، یاشەڕەبەران ، یا گایەك بەربدرێتە گیانی گایەكی تر••!! ئاماژە بەم مەبەستەیە ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە ـ ان النبي صلی اللە علیە وسلم ـ نهي عن التحریش بین البهائم) ئەبوو داود و ترمذی •

د ـ العاب الفروسیة ـ واتە رمبازی •• ،لەپێشەوە باسمان كرد •

هـ ـ راووشكار ـ الصید ـ بەو مەرجانە لەكتێبە فیقهیەكانا باسكراون •

و ـ یاری شەترنج •• واتە ئەمیش پەسەندە بەم سێ مەرجەیە :

١ ـ هیچ جۆرە خوا پەرستیەكی پێ دوانەخات لەكاتی دیاری كراوی خۆیدا •

٢ ـ وتەی ناشیرین ـ لەكاتی یاریەكەدا ـ لە زمانی دەرنەچێت •

٣ ـ لەسەر شت نەبێت •

[ لێرەدا مامۆستا تەماشای کاتژمێر ئەکات و بیری ئەو قوتابیانەی ئەکەوێتەوە کە بەتەمای کردوون (محاضرة)یەکیان بۆ بدات ••بۆیە ماوەی مام عەلی داو ، مامعەلیش خوا حافیزی کرد و ڕۆیشت ] •

## دیمەنی سەشتەم

**[ زستانی پڕ لە ئازار و غەم و خەفەت لە پێچانەوەی چێغ و چەلای خۆیدا ، ئەو زستانەی کە هەرچی شتە ـ بەهۆی نالەباری ئەوەوە ـ توندی بەندیخانە کراوە •• بەتایبەت مەردومە ماف خوراوەکان هەموو ڕەنگیان پتر زەرد وەرگەڕابوو •••! لاواز •• زەبوون ••**

**بەهاری خۆشی و شادی و بەختیارییش خۆی ئارایش داوە و ئەیەوێ زستان تارنێ و بڕواتە جێگاکەی و توزێ دڵی ئادەمیزادەکان خۆش بکات ••• بەڵام بەو مەرجەی خەڵکەکە خۆی حەزی لە ئازادی و سەربەستی و کامەرانی بێت •••! چونکە ئازادی بە زۆر ناکرێ بەقوڕگی هیچ گەلێکدا ••**

**لەم کاتەدا مام «عومەر» دێتە خزمەت مامۆستا و سەلامی لێ ئەکات و زۆر بە ئەدەبەوە دائەنیشێ •• دیارە مام عومەرییش خاوەن منداڵە و ئیسلامیشی زۆر خۆش ئەوێ ، بۆیە پێی خۆشە منداڵەکانی بەرەو ڕێبازی قورئان ڕێگە بگرنە بەر ] •**

**مامعومەر :** مامۆستا ؛ خوا پایەدارت کات ، وە وێنەی تۆمان بۆ زیاد بکات •• یەك دوو ڕۆژە ئێواران لە ماڵی مام عەلی دائەنیشین، ئەویش ـخواپاداشی بداتەوە ـ شانی پیا ئەکات یەکە یەکە ووتەکانی جەنابتمان بۆ باس ئەکات سەبارەت بەپەروەردە و بەخێو کردنی منداڵ ••• ئەوەی ڕاستی بێ منیش هاتم بۆ ئەوەی ئەندازەیەکی ترمان بۆ باس بکەیت•

**مامۆستا :** مام عومەر ئەرکی سەرشانی موسڵمانە چیبیست لە خێر و چاکە بۆ موسڵمانەکانی تری باس بکات ••

بەڵێ •• مامۆستایانی پەروەردە هەندێ شتی تریان پێش چاو گرتووە ، وا منیش پشت بەخوا ـ پێشکەشیان ئەکەم بەم شێوەیە :

١ ـ هەوڵدانی منداڵەکە بۆ بەدەست گرتنی ئیش و کارێکی پەسەند لە شەریعەتی ئیسلامدا • واتە پێویستە لەسەر کاربەدەستی منداڵ •• منداڵەکە ڕاپەڕێنێ بۆ کاسبیەکی ڕەوا و سەربەست ، وەك پیشەسازی و کشت و کاڵ و بازرگانی •• چونکـە پێغەمبەران ـ علیهم الصلاة والسلام ـ کـە پێشەوای ڕاستەقینەی ئایینن هەریەکەیان ئیشێکی گرتۆتە ژێر دەست ، لەو لایشەوە خەریکی ڕاگەیاندنی بەرنامەکـەی خوا بووە بـەو شێوەیە خوا ویستوویەتی •

- ئەوە (نوح) پێغەمبەر ـ درووودی خوای لـەسـەر بێت ـ کەشتیی دروست ئەکرد •
- ئەوە (داود) پێغەمبەر ـ درووودی خوای لەسەر بێت ـ ئاسنگەر بوو و کەرەسەی جەنگیی دروست ئەکرد •
- ئەوە (مووسا) پێغەمبەر ـ درووودی خوای لەسەر بێت ـ شـوانی ئەکردو کرێی وەر ئەگرت •
- ئەوە پێغەمبەرمان ـ محمد ـ «صلی الله علیه وسلم ـ چەندان ئیش و کاری کرد بۆ ژیانێکی ئازاد و سەربەخۆ و منەتی کەسی تیا نەبێت • لەم ڕوووەیشەوە ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر زۆرە ، بۆ نموونە : یەکەم : (ان من أفضل الكسب كسب الرجل من يده) ئیمام ئەحمەد• دووەم : (ما أكل أحدٌ طعاماً قطّ خيراً من ان يأكل من عمـل يده ، وإن نبيّ الله داود كان يأكـل مـن عمـل يده) • بوخاری وابن ماجەو ئەحمەد •

پێویستە هەوڵ بدرێ بۆ ژیان •• بۆ پاشەڕۆژ •• بە شێوەیەك وا بزانێ قەت نامرێ ، چونکـە ماڵ و سامان بڕبڕەی (جیهاد)ە ، بێجگـە لەمەیش ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆر خەشمی هەیە لەوانەی بێ کارەن و بەسەر خەڵکەوە ژیان ئەبەنـە سـەر (عومەری کوڕی خەتاب) خەلیفەی

دووەم ـ خوا لێی رازی بێت ـ ئەفەرموێ : (بەدوای ژیاندا بگەڕێن ‥ پاڵی لێ مەدەنەوە و بڵێن خوایا رۆزیم بدەرێ ‥! لە کاتێکدا ئەزانن کە یاسای خوا وایە : ئاسمان زێڕ و زیو نابارێنێ) ٠

هەزار ڕەحمەت لە پێشەوا شافیعی[١] کە ئەفەرموێ :

لَنَقلُ الصخر من قُلَلِ الجبال    اَحبُّ الي مـن منن الرجـال

يقـول النـاس كسب فيـه عـار    فقلت العار في ذلّ السؤال[١]

لەم فەرموودانە و وێنـەیانەوە دەرئەکـەوێ ئاینی ئیسـلام ئیش و کاری زۆر بەکرنگ گرتووە ، فەرمانیشمان بەسەرا ئـەدات بۆ ئـەوەی رۆڵەکانمان فێری کاری هونەری بکەین ٠ ئەمەیش بەگوێرەی کات و لیهاتوویی منالە کە ئەگۆڕێ ‥

کەوابوو دوای ئەوەی کە ساڵەکانی سەرەتایی تەواو کرد ،پێویستە رام بکرێ لەسەر هەندێ پیشەسازی و هونەر ٠

(إبن سینا) ئەفەرموێ : «کاتێ منـاڵ فێری قورئـان بوو و هێندێ ڕێزمانیش ی لەبەرکرد ‥ ئینجـا ئەبێ تەمـاشای زیرەکی و ئەوەدەنی بکرێ ‥ شانی کام ئیشی هەڵ ئەگرت ئەوەی پێ بکرێ ‥ » واتە ئەگەر زیرەك بوو باپلەکانی خوێندن تەواو بکات ‥ وە لـەکاتی پشوودانیشدا فێری کار و کاسبی یەك بکرێ ‥

(١) پێشەوا (شافیعی) لـە سەردەمی (هارونەرەشید)ا کرا بە (والی) نـەجران لە (یەمـەن)دا وە ملەملەیـەکـی زۆری کـرد لـە گـەڵ کاربەدەستەکانی ئەو سەردەمەدا ، بۆیە درو ۆ دەلەسەیەکی زۆریان بۆ پێك هێنا و سەرئەنجام لە گەڵ (٩) کـەسی تردا کەلەمچەیان کردنو ناردنیان بۆ (بـەغدا) بۆ لای (خـەلیفە) تا لـە سێدارەیان بدا ، بەڵام خوا ئەمی پاراست و هاوەڵەکانی دران لە سێدارە ‥!!

(٢) واتە: بەردکێشانم پێخوشترە ـ لە سـەر لووتکـەی کێوەکان ـ تا منەتی خەڵکی ‥ مەردووم ئەڵێت :کردو کاسبی عەیب و نەنگە، منیش ئەڵێم : نەنگو نامەردیی سواڵو دەست پانکردنەوەیە ٠

«پیشەسازی ئەبێ بەدەسەبەر بۆ دوور خستنەوەی هەژاری لە خێزان ، خۆ ئەگەر کەودەن بوو ، ئەوە پێویستە دوای ئەوەی کاروباری ئاین تێگەیەنرا فێری پیشەسازییەك بکرێ ، چونکە بەڕاستیی ئەوانە منالێك سەلیقە و ئەقڵی خوێندنی نەبێت بەزۆرو دارکاری خەریك بکرێ ...!!

ئامازە بەم مەبەستانەیە ئەم فەرموودەیە کە ئەفەرموێ :

« إعملوا فكلُّ ميَسّر لما خلق له .. » «واتە تێ بکۆشن ، چونکە هەریەکە بۆ کارێکی تایبەتی دروستکراوە .

وە هەروەها دایکی موسڵمانان خاتوو عایشە ئەفەرموێ :

(أمرنا رسول الله – صلى الله عليه وسلم – ان ننزّل الناس منازلهم).

بە کورتی : ئەو منالە ئارەزوو هەوەسی لە چییە ، پێویستە لەسەر پەروەردەکەر رێگەی بۆ ئاسان بکات ، بۆ ئەوەی بە زۆرەملێ بەسەر ئیشەکەدا نەڕواو لە ئاکامیشدا هیچ بەدەست نەهێنێ و دەستە ئەژنۆ دانیشێ ...

بەهەزارەها درووودو سڵاو لەسەرگیانی پاکی پێغەمبەر بێت بۆ ئەو فەرموودەیەی کە ئەفەرمووێ : « رحم الله والداً أعان ولده على برّه » .

واتە : سۆزی خوا لەسەر باوکێك بێت یارمەتی منالەکەی بدات بۆ چاکە .

مام عومەر ؛ بەجوانی گوێ بگرە بزانە ئیسلام چۆنە و کۆمەڵی ئێستا چۆنە ئای داخەکەم ! چەند لە ئیسلامەوە دوورە !

٢ – هێشتنەوەی دەرفەت و بکایەیە بۆ یاری و حەسانەوە .

مام عومەر ؛ ئاینی ئیسلام ، ئاینی واقیع و ژیانە ، لەگەڵ مرۆڤدا وا ئەجووڵێتــەوە کــەمرۆڤ داخوازی دڵی و دەروونی و سروشتیی بۆ هەیە ، واتە پێویستی نەکردووە کە هەمووکات لەبیری پاشەڕۆژدابێ ٠٠وە نان و خۆراك لــە خۆی حــەرام بــکات ٠٠ نــەخێر ٠٠ بەڵکو ڕێگــەی هێشتۆتەوە بۆ جێبــەجێ کردنــی هــەموو جۆرە داخوازێك بەمــەرجێ لــە چــوار چێوەی ئیســلام دەرنــەچێت ٠ بۆیە پێغــەمبەر ـ صلــی الله علیه وسلم ـ لە وەڵامی (حنظلە)دافەرمووی : لە کاتێکدا ناوبراو گلەیی لە خۆی ئەکردو ئەی ووت تاوام لەخزمەت پێغەمبەردا ووردەکێك لــە یادی خوانابڕێم ، کە دوورکەوتمەوە ٠٠ دوورئەکەومەوە لەیادی خوا ـ فەرمووی سوێندم بەو کــەسەی گیانمی بەدەستە ئەگەر هەر ئاوابن کــە لەلای منن و لەیادی خوادابن ٠٠ فریشتەکان لــە ڕێگە و باندا تەوقەیان لەگەڵ ئەکردن ، بەڵام ـ حنظلە ـ بەینا و بەین ٠٠ پشوو و حەسانەوە و ئینجایادی خوا ٠٠

پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەگەڵ منالی هاوەڵەکانیدا یاریی ئەکرد و دڵی خۆش ئەکردن :

یەکەم : پێشەوا ئەحمــەد ئــەگێڕێتەوە ٠٠ «پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ عەبدوڵڵا و کثیر و عبدوڵلای کوڕی عەباسی ریز ئەکرد و ئەیفەرموو « هەرکەس زوو بگاتە لام فلانەشتی ئەدەمێ ٠٠ » ٠ ئیمامی ئەحمەد ئەفەرموێ مناڵەکان بــەجارێ رایان ئەکرد بۆ لای پێغەمبــەر و ئەکەوتن بەسەرسینگ و پشتیا ٠٠ ئەویش ئەیگوشین بــەخۆیا و ماچی ئەکردن ٠

دووەم : (تەبەرانی) ئەگێڕێتەوە لە (جابیر)ەوە ـ خوای لێ ڕازی بێت ٠٠ ئەفەرموێ : « چوومە خزمەتی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەبینم هەردوو دەستی دادابوو و لەسەر ئەژنۆ ئەڕۆیشت ٠٠ [حەسەن و حسین] یش بەمدیوو بەودیویا خۆیانیان هەڵواسیبوو ئەیفەرموو :

« بەهـ حوشترەکـەتان •• حوشتری چاکـە ، وەئێوەیـش بـاری چاکن •• » [ نعم الجمل جملکما ، ونعم العدلان انتما ] •

ئینجا ـ مام عومەر ـ زانایانی پـەروەردەی ئیسلامیی هاوار و داوا ئەکەن بە پشوودان و حەوانەوەی منالٌ ، دوای ئەوەی لـە قوتابخانە و ئیش و کاری هاتـەوە ، وەك بلیمەت و فەیلـەسووفی ئیسـلام ـ ئیمامی غەزالی ـ ئەفەرموێ : پێویستە منالٌ دوای ئـەوەی لە قوتابخانە هاتـەوە یارییەکی جوان و شیرین بکات بۆ ئـەوەی ماندووبوونی قوتابخانەکەی لەبیر بەرێتـەوە ، چونکـە بـەرگری منـالٌ لەیاری و بـەردەوام بوون لەسەرخوێندن بە درێژایی ڕۆژ •• دلٌ ئەمرێنێ و و زیرەکی ئەفەوتێنێ•• ئینجا دەست ئەکات بەفێلٌ و تەلٌەکـە لێدان بۆ ئەوەی لـە خوێندن خۆی ڕزگار بکات •• » •

٣ ـ پەیوەستیی لە نێوان مالٌ و مزگەوت و قوتابخانە :

واتە پێویستە مالٌ و مزگەوت و قوتابخانەی منالٌ وەك یەك بن ، بەو مانایە لە مالٌەوە ، وەیا لە قوتابخانە شتێك نـەچێت بـەگوێیا پێچەوانەی ئەوەی مزگـەوت بێ لەڕووی پـەروەردە و پێگـەیاندنەوە •• ئەگـەر ئاوابوو ئەوە بێگومان ئـەو منـالٌە وای لێ دێت لە پیـاوەتی و جوامێریدا پەنجەی بۆ رابکێشرێ • ئەرکی ئەمەیش بۆ یەکەم جار ئەکەوێتە ئەستۆی باوکان •• ئینجا پەروەردەکەران ، ئاماژە بەم مەبەستەیە ئەم فەرموودەی پێغەمبـەرە ـ صلى الله علیـه وسلم ـ [کفی بالمرء إثمـاً ان یضیّع مـن یقوت] ئەبوداود •

**مامعومەر :** مامۆستا ؛ سـەرم سـوڕئەمێنێ کاتـێ [مزگـەوت و قوتابخانە] بەیەکەوە باس ئەکەیت ؟ چونکـە ئێستا جیاوازییەکی ئێجگار گەورە هەیە لە نێوان قوتابخانە و مزگەوتدا ••!!

**مامۆستا :** مام عومەر ؛ ئەوە تۆ ئاگات لە وەزعی ئێستای قوتابخانەکان نییە ، ئەو وشکی و دووره پەرێزییەی جارانە نەما •• ئێستا سوپاس بۆ خوا قوتابی و مامۆستا لە قوتابخانەکاندا نوێژ بە جەماعەت ئەکەن •

مام عومەر ؛ زۆریش ناحەقت نییە ، چونکە :

أ ـ زۆربەی مامۆستایانی ، قوتابخانە و زانکۆکانمان پەروەردەیەکی ئەوتۆی پەسەند نازانن ••!! کەچی کۆرپەکانی ئێمەیش ئەوان گۆشیان ئەکەن بە ئوسلوب و شێوازی بێگانەکان •

ب ـ ئەو کتێبانەی لە قوتابخانەکاندا ئەخوێنرێن پڕن لە پلار و توانج لە ئیسلام •• وە بۆ هەڵنانی مرۆڤ بۆ لای بێخوایی و بێکۆتایی جیهان وەك : [ ماددە لە نەمان نایە •• لە هیچیش پەیدا نابێت بەڵکو لە شێوەیەکەوە دەبێت بە شێوەیەکی تر •• ] وە •• [ ماددە بەردەوامی هەیە ، واتە بەبەردەوامی هەیە ] •

ج ـ ڕێژەی وانە ئایینییەکان زۆر زۆر کەمە لە چاو وانەکانی تردا ، واتە ئەو گرنگییەی ئەدرێت بەزمانی ئینگلیزیی دە یەکێکی ئەوە نادرێت بە باسە ئایینییەکان ••!! بۆیە قوتابییەکان کاتێ دەرئەچن نازانن پێتێکی قورئان بە ڕەوانی بخوێننەوە ، وە شارەزای هیچ یاسایەکی بەرنامەی ئیسلام نین ، هەروەك لە ژیان و مێژووی دلێران و هەڵکەوتووەکانی سەرەتای ئیسلام نەشارەزایە •• کەوابوو لەم کاتەدا زیاتر منداڵ پێویستی بە یارمەتی و چاودێری هەیە بۆ ئەوەی کافر لە مێشکیا هێلانە نەکات •

٤ ـ ڕووخۆشی و خۆشەویستیی لەنێوان بەخێوکەر و منداڵەکەدا ! واتە ئەبێ زۆر خاوەن سۆز و بەمیهرەبان بێت لەگەڵ منداڵاندا •• وەزاناکانی پەروەردە و دەروون ناسی و کۆمەڵایەتی چەندشتێکیان پێش چاو گرتووە بۆ ئەم مەبەستە :

أ ـ پەروەردەکەر ئەبێ ڕووخۆش بێ لەگەڵ منالدا .

ب ـ دیاری و بەخشش و پاداش و ئافەرین هەرکات لە هەرئیشێکیا سەرکەوتوو بێت .

ج ـ کردار و ووتەی جوان و شیرین بێ .

د ـ گوێگرتن بۆ قسەی و ، وەڵام دانەوەی داخوازیکەیانی .

هـ ـ پەروەردەکەر خۆی بباتە ڕیزی منالەکەوە [ نعم الجمل جملكما ونعم العدلان أنتما ] .

ئاماژە بـە رووخۆشی و خۆشـەویستی‌یـە ئـەم فـەرموودەیە کـە (ئەبودەرداء) ئەفەرموێ :

[ مارأيت او سمعت رسـول الله ـ صلى الله عليـه وسلم ـ يحدث حديثاً إلا تبسّم .. ] . سەبارەت بەدیاری و بەخشینە :

« پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ دیاری وەرئـەگرت و پاداشی ئەدایەوە .. » .

لەڕوی سۆز و بەزەیی‌یەوە بوو (پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ دەستی ئەهێنا بەسەری منالدا و ماچی ئەکرد ، یا ئەفەرموێ :

« نوێژم دائەبەست پێم خـۆش‌بوو درێژەی بدەمێ .. ئینجـا کـە گریانی منالم ئەبیست نوێژەکەم بەپەلە ئەکرد ... » واتە زوو نوێژەکەم تەواو ئەکرد و ئەچوم بە سەردەم منالەکەوە ..

وە هەروەها لە بەر ڕێزی هاوەڵەکانی و شیرینی کرداری بوو کـە وەك خاتوو عائیشە ئەفەرمووێ : ( لە هەموو کەس نەرم و نیان‌تر بوو ، ڕووخۆش‌تر بوو ، وە بـە درێژایی تەمـەنی قاچی ڕانـەکێشاوە لـەناو هاوڕێکانیدا .. ) .

وە زۆر جار عەباکەی ڕائەخست بۆ میوان و ئەیفەرموو : [هەرکات هەڵبژێراوی عێلێك هاتەلاتان ڕێزی لێ بگرن •• ] •

٥ ـ بەپێی پرۆگرام و ڕێباز ژیان بەرێتەسەر ••

**مامعومەر** : مامۆستا ؛ چۆن منـاڵ بـە پێی پرۆگرام ژیانی بێ ببرێتەسەر •• حەزئەکەم تۆزێ ڕافەی بکەی بۆمان ••؟

**مامۆستا :**

أ ـ ئاشکرایە هەرشتێك بـەپرۆگرام بڕوات فێری یاسـا و ڕەوشت ئەبێت و خووی پێوە ئەگرێ و لە پاشەڕۆژیشدا دەوامی لەسەر ئەکات •• هەر لەبەر ئەمەیە پەروەردەکەران ئەمەیان پێش‌چاو گرتووە •• جا منیش ـ پشت بە خوای گەورە ـ هێندی لەوانە کە لە کردار و ووتەی پێغەمبەرەوە وەرگیراون بۆتانی باس ئەکەم :

- چەند جوان و شیرینە کاتێ لە خەو خەبـەرت بوووەوە ئـەم نزایە ـ کە لە پێغەمبەرەوە وەرگیراوە ـ بخوێنی و ئینجـا مناڵەکـەیشت فێر بکەیت :

[الحمد لله الذي أحيانا بعد ما أماتنا واليه النشور] •

**بوخاری و موسلیم**

- یاسای لەسەر ئاوچوون •• پێویستە بۆ موسڵمان خۆیو و منـاڵ و خێزانی فێری بن ، چونکـە پێغـەمبەر ـ صلى الله عليـه وسلم ـ وایکردووە •

ـ کاتێ ئەڕواتە زوورەوە (پێی چەپێ) بخاتەپێشەوە و ئـەم زیکرە بخوێنێ :

( اللهم اِنّي أعوذُ بِكَ من الخبث والخبائث ) •

**بوخاری و موسلیم**

ـ ئەوەی ناوی خوا ، یاقورئـان ، یـا هـەرناوێکی پیرۆزی لـێ نووسرابێ ، لەدەرەوە دایبنێ و نەی‌باتە سەرئاو •

ـ له پێش چاو خه‌ڵکیدا دانه‌نیشێ ، واته ئه‌گه‌ر ده‌شتی کاکی به‌کاکی بوو دوور که‌وێته‌وه له خه‌ڵك •

ـ ڕوونه‌کاته ڕووگه و پشتیشی لێ نه‌کات •

ـ له ڕێگه و جێگه‌ی کۆبوونه‌وه‌ی خه‌ڵکدا دانه‌نیشێ •

ـ له سه‌ر ئاوده‌ست قسه نه‌کات •

ـ به باشی خۆی پاك بکاته‌وه •

ـ به ده‌ستی چه‌پ خۆی پاك بکاته‌وه •

ـ کاتێ هاته ده‌ره‌وه [پێی ڕاستی] پێش بخات و ئه‌م ویرده بخوێنێ: [الحمد لله الذي أذهب عنّي الأذى وعافاني] •

ـ کاتێ هاته ده‌ره‌وه ده‌ستی به (سابوون) بشۆرێ • چونکه (جه‌ریر) ئه‌فه‌رموێ : (من له خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ردا بووم •• کاتێ له‌سه‌ر ئاو بهاتایه‌ته ده‌ره‌وه ئه‌یفه‌رموو : ئاوێکی پاك بێنه •• منیش ئاوه‌کم بۆ ئه‌هێنا و ده‌ستی پێ ئه‌شۆری و ئه‌یشی هێنا به‌گڵدا ••)(١) •

[ نه‌سائی له جه‌ریره‌وه گێڕاویه‌ته‌وه ] •

● مام عومه‌ر ؛ ئینجا له پێش چاویه‌وه ده‌ست نوێژێکی ڕێك و پێك هه‌ڵگره و خێر و گه‌وره‌یی ده‌ست نوێژی بۆ باس بکه •

ـ دوعای دوای ده‌ست نوێژی فێر بکه •

ـ دوای ده‌ست نوێژ دووڕه‌کات نوێژ بکات •

ـ به گوێره‌ی ده‌سه‌ڵات و توانین له‌گه‌ڵ خۆت شه‌ونوێژی پێ‌بکه • چونکه شه‌ونوێژ :

---

(١) مه‌به‌ستی پێغه‌مبه‌ر ـ صلى الله عليه وسلم ـ پاك و خاوێنی یه‌ولابردنی ئه‌و پاشه‌ڕۆکه‌یه ئه‌نووسێ به‌ده‌ستی مه‌ردوومه‌کانه‌وه له کاتی خۆ پاك کردنه‌وه‌دا ، جا ئیتر به هه‌ر شتێ ببێ باشه •• وه‌ك سابوون و ئامێری کاره‌بایی که ئێستا باون •

ـ شارێگەیە بۆ گەیاندنی بەندە بە بەهەشت •

ئەوی شەونوێژ بکات لای خوا بە بەندەیەکی ڕاستەقینە دائەنرێ •

ـ لە خوا نزیکی ئەکاتەوە و گوناهی دائەماڵێ •

ـ لەگەڵ خۆت بیبە بۆ مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی •

ـ دوعای دوای بانگی فێربکە : [ اللهم رب هذه الدعوة التامة ، والصلاة القائمة ، آت محمداً الوسيلة والفضيلة ، وابعثه مقاماً محموداً الذي وعدته •• ] بوخاری

ـ گەورەیی نوێژی جەماعەتی بۆ باس بکە •

ـ وێرد و ئەورادی دوای نوێژی پێ بڵێ •

ـ بەتایبەت زیکری شێوان و بەیانیی وەك : [لا إله إلاّ الله وحده لا شريك له ، له الملك وله الحمد ، وهو على كل شيء قدير ] ١٠جار •

ـ [ اللهم أجزني من النار ] ٧جار •

ـ [ اللهمّ إني أسألُكَ الجنّة ] ٨جار • ئەمە و ئەو دوعایانەی ترە کە لە پێغەمبەرەوە ـ صلى الله عليه وسلم ـ وەرگیراون •

ـ لەگەڵ خۆت دەست بکات بەخوێندنی قورئانی پیرۆز هەرچەندە رێکەوت •

مام عومەر ؛ دەوام لەسەر قورئان خوێندن زۆر پێویستە با کەمێکیش بێت ، بۆ ئەوەی مەردوم لە ژیانیا ڕۆژێ لێی دوورنەکەوێتەوە •• هەر لەبەر ئەمەیش بوو زاناکان ـ خوا پاداشیان بداتەوە ـ قورئانیان کردووە بە [٦٠]بەشەوە ـ حزب ـ وەهەر ـ (حزب)ێکیان کردووە بە چوار بەشەوە •• جا ئەگەر مرۆڤ بۆی نەگونجا هەمووجار بەشێکی زۆری لێ بخوێنێتەوە ، با هەموو بەیانییەك ¼ی (حزب)ێك دەوربکاتەوە •• ئەگەر بەم شێوەیە بڕوا و دەوام بکات بەماوەی (٢٤٠) ڕۆژ ، واتە (٨) مانگ دەورێکی تەواوی قورئان ئەکاتەوە بێ ماندوو بوونو پەلەپەل •• بەڵکو ئەیشتوانێ بەدەم ئەوەوە گەلێکی لەبەربکات •

بە کورتی :

دەست لەو خێروبێرە هەڵمەگرە ، چونکە قورئان وەکو پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەفەرموێ :

(هەرکەس حەرفێکی لێ بخوێنێ (١٠) چاکەی بۆ ئەنووسرێ ، خو ئاشکرایشە هەرچاکەیەك بە (١٠) قات پاداشی بۆ هەیە ، من ناڵێم [الم] یەك پیتە ، بەڵکو (ئەلف) پیتێکە (لام) پیتێکە ، (میم) پیتێکە) .. جا هەر بەو جۆرە سەرنج بدە و بیر بکەرەوە لەو هەموو ووشە و پیتانەی قورئانە .. (سەعالەبی) لە تەفسیرەکەی خۆیدا ئەفەرموێ : ژمارەی پیتەکانی قورئان هەزار هەزار و بیست و چوار هەزار پیتە ـ واتە یەك ملیون و بیست و چوار هەزار پیتە .

کەوابوو با هەموولایەکمان دەوام بکەین لەسەر قورئان خوێندن و لەبەرکردنی .

● رابهێنرێ و مەشقی وەرزشی پێ بکرێ .. چونکە قورئان ئەفەرموێ : [وأعِدّوا لَهُم ما استطعتم من قوّة .. ]

هەروەك پێغەمبەری خۆشەویستمان ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەفەرموێ : (المؤمن القَويّ خيرٌ وأحبُّ الى اللهِ من المؤمن الضعيف وفي كُلٍّ خير .. ) .

ئەم وەرزشە هەموو جۆرە وەرزشێك ئەگرێتە وە ، وەك ڕاکردن و زۆران گرتن و هەڵگرتنی شتی قورس و .. هتد .

چەند جوان و پەسەندە ـ مام عومەر ـ منداڵ ئامادەی رۆحی و لاشەیی بکرێ بۆ پاشەڕۆژی ئیسلام و پاراستنی خاکی ئیسلام . بۆ ئەوەی هەمووکات لەقەرەوڵدا بێت .

● موتاڵەی کتێبە زانیاری‌یەکان بکات ، چونکە خوا ئەفەرموێ بە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ کە بڵێ (وقل ربّ زدني علماً طه/١١٣ خوایا زانیاریم زیادبکە •

چونکە ئەگەر قوتابی بێت ، ئەم موتاڵەیە ئەبێ بەیارمەتی دەری لەقوتابخانەدا وە ئەگەر کرێکار و کاسب بێت ئەوا بیری تیژ ئەبێت و سەلیقە پەیدا ئەکات •

● ئاداب و ڕەوشتی دەرچوونی ماڵەوەی فێر بکرێ ••

ـ کاتێ پێڵاو ، یا پاڵتۆ ، یا کراس ، یا هەرشتێکی‌تر لەبەر بکات بالەراستەوە دەست پێ‌بکات واتە ، لەپێشەوە دەستی ڕاستی ، یا قاچی ڕاستی •

ـ لەکاتی داکەندنیاندا لە چەپەوە دەست پێ بکات ، چونکە یاسای پێغەمبەر وابووە بۆیە ئەفەرموێ :

(اذا انتعل أحدكم فليبدأ باليمنى ، واذا خلع فليبدأ بالشمال) موسلیم•

ـ دوعای دەرچوونی ماڵەوەی فێر بکرێ ، چونکە کاتێ پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە ماڵی دەرئەچوو ئەیفەرموو : « بسم الله ، توكلت على الله ، لا حول ولا قوة الا بالله » ئەبووداود و تیرمذی و نەسائیی •

● ئاداب و یاسای بەڕێگەدا ڕۆشتن فێر بکرێ بەم شێوەیە :

ـ زۆر لەسەرخۆ و نەرم و نیان بڕوا بە ڕێگەدا ، چونکە خوا ئەفەرموێ :

[ وعباد الرحمن الذين يمشون على الارض هوناً ، واذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاماً ] الفرقان : ٦٣

ـ لە ئاستی نامەحرەمدا چاو داخا[١] ، چونکە خوا ئەفەرموێ :

---

(١) هەر ئافرەتێك ئیسلام ڕێگەی خواستنی بدات ئەوە نامەحرەمە •

{ قـل للمؤمنين يغضوا من أبصارهـم ويحفظوا فروجهـم ... وقـل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن ويحفظن فروجهن ...] النور/٣٠ .

ـ فێری سەلام کردن بکـرێ و بڵێ : [السلام علیکـم] وەڵامـی سەلامبداتەوە بە [وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته] ، وە هەروەها سڵاو بکا لەوکەسەی بیناسێ ، یا نەیناسێ .

ـ هەرکات گەیشت بە هاوڕێکانی تەوقەیان لەگەڵ بکات ، چونکـە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەفەرموێ :

(اذا التقی المسلمان فتصافحا وحمدا الله ، واستغفراه غفر لهما) .

واتە هەرکات دوو موسڵمان گەیشتن بەیـەك و تەوقـەیان کرد و سوپاس و ستایشی خوایان کردو ، داوای لێ بووردنیان لێکرد خوالـە تاوانەکانیان خۆش ئەبێت .

ـ لە رۆیشتندا قەراغی ڕێگە بگرێ .

ـ شتێ نەخاتە سەر ڕێگە کە ببێتە هۆی ئەزیـەتدانی خـەڵکی ، چونکە پێغەمبەر ئەفەرموێ : (لا ضـرر ولا ضـرار) .

ـ هەرشتێکی بەرچاو کەوت لـەسەر ڕێگـە وەك دڕك و بـەردو شتیوا دووری بخـاتەوە ، چونکە پێغەمبـەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەفەرموێ :

(الایمان بضع وسبعون شعبة أعلاهـا قول لا اله الا الله ، وأدناها اماطة الاذی عن الطریق) بوخاری .

ـ بەشێوەیەکی گشتی بەمـافی سەرڕێگـە ئاشنا بکرێ ، چونکـە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەفەرموێ « لەسەر ڕێگە دامەنیشن » وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ناچارین هەر ئەبێ دانیشین ، ئینجا پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ

فەرمووی : دە ئەگەر هەردائەنیشن مافی ڕێگەکە بدەن ، ووتیان : مافی ڕێگەکە چی‌یە ئەی پێغەمبەری خوا ..؟!

فەرمووی : چاو داخستن لەئاستی بێ شەرعی ، زیان نەگەیاندن بە موسڵمانان ، وەڵام دانەوەی سەلام ، فەرمان‌دان بەچاکە و دوورەپەرێزی کردن لە خراپە ..) .

- کاتێ چوو بۆ قوتابخانە مافی هاوڕێکەی بدات وەك ئەوە :سەلامی لێ بکات ، ئەگەر نەخۆش کەوت بڕوا بۆلای ، وەهەروەها لەکاتی شادی و شیوەن‌دا سەری لێ بدات ، وەلەکاتی تەنگانەدا یارمەتی بدات .

مافی مامۆستاکەی تێ بگەیەنرێ ، واتە مامۆستای قوتابخانە ، یا کارگە ، بەچاوی ڕێزەوە تەماشای بکات ، ئەگەر تووڕە بوو ئارام بگرێ، وەلەلایا زۆر بە ئەدەب و بەوێڵ‌بێ ، کاتێ ئەڕوا بۆلای داوای مۆڵەتی لێ بکات ، لە کاتی قسەکردنیا گوێی بۆ بگرێ تا لێ ئەبێتەوە ، لە کۆتایدا ترسی خوا و چاودێری خوا بخەرە دڵیەوە ، وەئاگاداری نوێژەکان بکات و لەکاتی خۆیاندا بیبان‌کات ، وەهەڵسووکەوتی لەگەڵ پیاوچاکاندا بێ .

مام عومەر ؟ هەوڵبدە نوێژی شێوان و خەوتنان لە مزگەوتی گەڕەکەکەدا بەجەماعەت بکەن ، چونکە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - ئەفەرمووێ :

( صلاةُ الجماعة أفضل من صلاة الفذّ (الواحد) بسبع وعشرين درجة) . بوخاری و موسلیم

- کاتی ئەڕۆن بۆ نوێژ،خۆت و مناڵەکان جل و بەرگێکی پاك و پوختە و جوان و قەشەنگ لەبەربکەن ، خوا ئەفەرموێ :

[ خذوا زينتكم عند كل مسجد ] .

- کاتێ ئەڕۆن بۆ مزگەوت شتی بۆگەن - وەك پیاز و توور و

سیرو مەخۆن یا خەڵك ئەزیەتبار نەبن ، چونکە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرمووێ :

« من أكل ثوماً أو بصلاً فليعتزل مسجدنا[1] » بوخاری وموسلیم.

ـ خۆت و خاوو خێزانت جێگە و نیشتگەی حەوانەوەت پاك و خاوێن ڕابگرە ،چونکە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەم فەرموودەیەی لەبەر ئەوە فەرمووە :

[ إن الله طيّب يحبّ الطيّب ، نظيف يحبّ النظافة ، كريم يحبّ الكرم ، جواد يحبّ الجود ، فنظفوا أفنيتكم ولا تشبّهوا باليهود].

ـ كاتێ لەماڵ دێیتە دەرەوە بۆ نوێژ ئەم دوعایە بخوێنی :

[ اللهم اجعل في قلبي نوراً ، وفي لساني نوراً ، واجعل في سمعي نوراً ، واجعل في بصري نوراً ، واجعل من خلفي نوراً ، ومن أمامي نوراً ، واجعل من فوقي نوراً ، ومن تحتي نورا ، اللهم اعطني نوراً ] .

ـ گەیشتیتە مزگەوت پێی ڕاست پێش بخە بۆ ناو مزگەوت ، ئەم دوعایە بخوێنە [اللهم صلّ وسلم وبارك على سيدنا محمد ، ربّ اغفر لي ذنوبي وافتح لي أبواب رحمتك ] .

ـ چوویتە مزگەوت پێش ئەوەی دانیشی دوو ڕکات نوێژی (تحية المسجد) واتە (دیاری مزگەوت) بکە .

ـ كاتێ هاتیتە دەرەوە پێی چەپت پێش بخە لە دەرگای مزگەوتدا ، ئەم دوعایەش بخوێنە :

---

(١) واتە ئەوکەسەی سیر ، یا پیازی خوارد بادوورکەوێتەوە لە مزگەوتمان ، دیارە هەر شتێکی بۆگەنی ترکە خەڵکی پێ کاس ببن ـ وەك هەندێ جگە رەکێش .. ئەوە نابێ بێنە ڕیزی جەماعەتەوە ..!

[ اللهم صل وسلم وبارك على سيّدنا محمد ، ربّ اغفر لي ذنوبي ، وافتح لي أبواب فضلك ] •

● ئیش‌وکاری قوتابخانـەیان پێ تـەواو بکە ـ مام عومەر ـ وەك نووسینەوە و پیاچوونەوە و بیر کردنەوە لە وانەکانی •

ـ هەر ئیشێ ئەکەن ئەبێ بەرێك‌وپێکی فـەراهـەمی بێنن چونکـە پێغەمبـەرمان ـ محمد ـ صلی الله علیـە وسلم ـ وای فـەرمان داوە وەك ئەفەرموێ :

[ ان الله یحبُ اذا عمل أحدکم عملاً ان یتقنه ] رواه البیهقی •

ـ ئەو شتانەی کـە ساڵەها دووبارە ئەبنەوە و دێن‌و ئەڕۆن ، وە بیرویادی ئیسلامیان تیایە هەوڵ بدە لەکاتی خۆیدا بۆ خاووخێزانی باس بکـە ، بۆ وێنـە وەك (اسراء ومعراج) شەوڕەوی و رۆیشتنی پێغەمبـەر بۆ ئاسمانەکان ـ وە لەمەیشەوە باسی (المسجد الاقصی) بکـە کـە ئێستا جوولەکەی تەرەس داگیری کردووە ، واتە هۆی زاڵ بوونی جوراەکـە بەسەر موسڵمانەکاندا باس بکـە ، ئینجا راڤەی ئەوە بکـە کـە ئیسرائیل ناتوێتەوە و [فەلەستین] رزگار نابێت بە دەستی موسڵمانەکان نەبێت ، کـە شیعار و دروشمیان تەنها ئیسلامە •

ـ هەمووکات خۆشی و زەوق و شەوق بخەنە ناو خێزانتەوە •

ـ مەتەڵی جوان جوان و مانا داریان لێ هەڵێنە •

ـ سەرگوزەشتە و چیرۆکی پڕمانا و واتایان بۆ بگێرەرەوە •

ـ جۆرەیاری یەکانی وەرزشی‌یان لـەگـەڵ بکـە ، گفت و گۆی ئەدەبی و ڕەوان بێژیان لەگەڵ بکە ، چیرۆکی کۆمەڵایەتی و مێژوویان بۆ باس بکە •

ـ ئێواران خاووخێزان زوو بخەوێنە •• چونکـە درەنگ خەوتن زیان ئەبەخشێ بە تەندروستی ، دەمار لەق و پەق ئەکات ، نوێژی بەیانیت

لەکیس ئەدات ، زوو خەوتن و زوو هەڵسان لە خەو سیما و نیشانەی پیاو چاکانە ، سامەگەر ئێشکی خێریان بەدەستەوە بێ ، ئەوە قەیدی نیە •

**مامعومەر:** مامۆستا ! ئەوە ئەچێ جەنابت زۆر شارەزای دانیشتنی ئیستایش و لەمەوپێشیشیان چۆن بووە ، بەڵام تۆ ئەوە بزانە کە ئەو جۆرە ئیستا تا نیوەشەو دائەنیشێ و بەیانیش تا هەتاو گەرم ئەکات لە خەو هەڵناسێ •

**مامۆستا :** مام عومەر ٠٠ بەڵێ شارەزاییم هەیە ، ئەزانم دانیشتنی ئیستایش و لەمەوپێشیشیان چۆن بووە ، بەڵام تۆ ئەوە بزانە کە ئەو جۆرە دانیشتنانە هیچیان شەرعی نین ، وە ئەگەر بە تەرازووی ئیسلامدا بیانکێشین بۆمان ئاشکرا ئەبێ کە سەد لە سەد حەرامە ، چونکە شەوی دزێژیان بەغەیبەت و ناوبردنی یەکتر و ناووناتۆرو و تەماشا کردنی فلیمی نامرۆڤانە ئەبەنەسەر ••!!

یا بە خوێندنەوەی [خورشید و خاوەر] و •• [شیرین و فەرهاد] و ••• [لەیلی و مەجنوون] و •• [مەنیجە وبێژەن] ••!! •• هەتد

● کاتێ چوویتە سەر جێگەی خەو ، پێش هەموو شتێك پەتوو و نوێنەکان بە باشی بتەکێنە ، نەوەك مار و مووری لەتوێ نوێنەکاندا بێت و ئەزێتت بکات ، ئینجا ڕاکشێ بەسەر لای ڕاستا و دەست نوێژیشت بێ و ئەم دوعایەش بخوێنە :

[اللهم أسلمت نفسي اليك،ووجّهت وجهي اليك،وفوضت أمري اليك، والجأت ظهري اليك ، رغبةً ورهبةً اليك ، لا ملجأ ولا منجى منك الا اليك ، آمنت بكتابك الذي أنزلت وبنبيّك الذي أرسلت ] •

بوخاری و موسلیم

ـ ئینجا بخەوە بەنیازی هەڵسان بۆ شەونوێژ

ـ ئەگەر تووشی بێ خەوی هاتی ئەم دوعایە بخوێنە :

[ اللهم غارت النجوم ، وهدأت العيون ، وأنت حيّ قيّوم لا تأخذك سنة ولا نوم ، يـاحيّ ياقيوم اهد ليلي وأنِمْ عيني .. ] پشت بـه خوا خەوت لێ ئەکەوێ .

مام عومەر ؟ ئەمانە کە باسم کردن بۆت پێویستە پیادە بکرێن دوای ئەو خاڵانەی لەپێشەوە باس کران .

هیوام وایە ، ئەگەر بەوجۆرە باس کرا ، هـەوڵ بدەیت لەگـەڵ رۆڵەکانتا ببنە پیاوو بلیمەتی پاشەڕۆژ یارمەتیش بەدەستی خوایە .

[وقل اعملوا فسيرى الله عملكم ورسوله والمؤمنون] .

ئینجا دوای ئەوەی پەروەردەیێکی باشت کرد – مام عومەر – ئەبێ هەوڵ بدەی بۆ فراوان کردنی ئـەو هۆیانـەی ئەبنە هۆ بۆ بیرتیژی و ڕۆشن بیری منالەکە وەك :

١ ـ کتێبخانەیەکی تایبەتیان بۆ تەرخان بکرێ ، وە جۆرەها کتێبی سوودبەخشی تێ بخرێ بەم شێوەیە :

أ ـ هەموو منالێك قورئانێکی خەتخۆش و ووشەگەورە .

ب ـ تەفسیرێکی کورت بۆ هەمووی قورئان .

ج ـ چەند کتێبێکی تایبەتی بە فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە ـ صلى الله عليه وسلم ـ

د ـ چەند کتێبێکی تایبەتی لە [فیقە]دا وەك [فتح القريب]ی کوردی [وە چۆن نوێژ دەکەی !] .

هـ ـ چەند کتێبێکی تایبـەتی بە عەقیدەی ئیسلامـەوە ، وەك [ئێستا بەختیارم]وە [خوا لە ڕوانگەی زانیارییەوە] یا [لەسەرەڕێی کاروانی باوەڕا] .

و ـ چەند کتێبێکی تایبەتی بەگردار و ڕەوشتی پێغەمبەرە ـ صلی اللە علیە وسلم ـ وەك کتێبەکەی خوا لێخۆش بوو ـ مامۆستا شێخ عبدالعزیز پارەزانیی هەردوو بەرگەکەی [ژیانی پێغەمبەری مەزن] محمد ـ صلی اللە علیە وسلم ـ

ز ـ چەند کتێبێك سەبارەت بەفیکرەی ئیسلامیەوە کە لەگەڵ ئەقڵیەتیاندا بگونجێن وەك [نموونەیەك لە ئیسلام] •• [لەدەروازەی ئیسلامەوە]•وە
[ بەرە و ڕێبازەکانی ئیسلام ] •

**مامعومەر** : مامۆستا ؛ حەز ئەکەم ناوی هێندێ کتێبی ترم بۆ باس بکەیت لەو بارەیەوە •

**مامۆستا** : مام عومەر ؛ بە ناشکوری نەبێ کتێبخانەکانی کوردستانمان پڕن لە خالی !! سەبارەت بە کتێبی ئیسلامیی ، جا لەبەر ئەوە ناتوانم دەست نیشانی کتێبی ترت بۆ بکەم ، چونکە نیە ، لەگەل ئەوەیشدا کوردوستان لە هەموو شوێنێ لەبارتر بووە بۆ نووسینی کتێبی ئاینی و کۆمەلایەتی •

جا لەبەر ئەوە هیوام ئەوەیە لەمەولا هەریەکەمان شەوو ڕۆژ بێ وچان خەریکی نووسینی کتێب و نامیلکە بێت بۆ کوڕە موسڵمانەکانی کوردستان بۆ ئەوەی لەڕێگە و ڕێبازێکی ڕاستەوە پێیان گەیەنێن بە لووتکەی ژیانی هەردوو جیهان ، بەڵکو خوایش سۆزو بەزەیی خۆی بڕێژی بەسەر هەموو وولاتەکانی ئیسلامدا بەتایبەت کوردوستانی خۆشەویستمان •

٢ ـ هاوبەشی گۆڤارێکی هەفتانە ، یا مانگانە ، بکات بەو مەرجە ئامانج و نیازێکی ئیسلامی بێت ، نەك ئەوانەی کە ئەبنە هۆی تێکدانی مێشك و دەروونی ، نەك ئەوانە کە نیگاری ئافرەتی بێ ئابڕوو و سەڵتەیان پێوەیە •

٣ ـ یارمەتی وەرگرتن بە هۆیەکانی روونکردنەوە وە «الاستعانة بوسائل الایضاح» واتە ئەو شتانەی بە نەخشە و نیگارەوە شتەکان پێش چاو ئەخەن وەك :

جوگرافیای وێنەدار و هەرشتێکی تری چاك •

٤ ـ سەردانی مۆزەخانەکانی بەیناو بەین ، چونکە گومانی تێدانیە سەردان لەو جۆرە شوێنانە ئەبێتە هۆ بۆ کردنەوەی چاو و دڵ و بیر و مێشکی •• و ئازایی و لێهاتوویی تیا دروست ئەکات ، وەگەلانی پێشوانمان یاد ئەخاتەوە •

٥ ـ سەردانی کتێبخانە گشتی یەکان •• هەرکات دەرفەت بوو • ئەمەیش سوود و قازانجی زۆرە •• فێری یاسای سەردان ئەبێت سۆزی هونەری و رەوان بێژی ئەجووڵێ •

٦ ـ هانەهانیی بدرێ بۆ ئەوەی موتاڵە و تەماشای کتێب بکات ، چونکە زانا خاوەنی پلە و پایەیە • نەك نەزان :

[ یرفع الله الذین آمنوا منکم والذین أوتوا العلم درجات •• ] • چونکە زۆر خوێندنەوە ئەبێتە هۆی ناساندنی ئیسلامێکی ڕاستەقینە ، ئەو ئیسلامەی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و وێنەیان ئەیان برد بەڕێوە •

کەوابوو پێویستە لەسەر شانی هەموو لایەکمان مناڵەکانمان تێبگەیەنین لە ئیسلام بەم شێوەیە :

ـ ئیسلام ئایین و دەوڵەتە •• واتە جیاوازی لەنێوان ئایین و دەوڵەتا نییە •

ـ قورئان رژێم و یاسایە بۆ هەردوجیهان واتە ئەبێ یاسای ژیانت تەنها لەقورئانەوە بێت •

- مێژووی ئیسلام •• واتە مێژوویەکی ڕاستەقینە و دوور لە گۆڕین (تحريف)ی ئیسلامی بۆ باس بکرێ •

ئەمانەیش بەم شێوەیە تەواو ئەبن :

- موتاڵەی کتێبە فیکری یەکان •

- موتاڵەی پەڕاوە مێژوویەکان •

● ئەو کتێبانەی پەیوەندیسان بەداگیرکردنی فیکرەوە هەیە [الغزو الفكري] • واتە نەخشەی کافران کە چۆن هاتنە ولاتەوە و هێلانەیان بەست ، پێش ئەوەی بەهێزی سەربازیی داگیرمان بکەن •

● ئەو کتێبانەی باسی شارستانیەتی ئیسلام ئەکەن ••

**مامعومەر** : مامۆستا ؛ جا چۆن ئەو منالە وای لێ بکرێ خوو بداتە موتاڵە و پەڕاو خوێندنەوە ؟

**مامۆستا** : مام عومەر ؛ ئاشکرایە ئەو منالە بەگوترە خوو ناداتە موتاڵە و خوێندنەوە ، بەڵکو ئەبێ •

△ نرخ و بەهای زانیاری و نەزانینی بۆ بکێشین •

△ ڕێزی زانا و نەزانین بۆ بەراورد بکەین •

چەند سوود بەخشە ئەگەر ئەو منالە بەختیاری زاناکان و نەگبەتی نەزانەکان بزانێ ، وەئاگادار بکرێ بەو پلەو پایەیە بۆ خوێنکاری ڕاست هەیە لای خوای گەورە •

△ هاندانیان بەم جۆرە :

- هەرکەس زوو ئەوە بخوێنێتەوە ،

- هەرکەس زوو موتاڵەی بکات •

- هەرکەس ئەوە لەبەربکات دیارییەکی باشی ئەدەمێ •

ئینجا تاقییان بکاتەوە •• کامیان بەیەکەم دەرچوو دیاری و بەخششی بداتێ بۆ ئەوەی زیاتر هەوڵ و کۆشش بدات ، وە تەمەڵەکەشیان

هەست بە ناتەواوی خۆی بکات ، بەڵکو لـە داهاتوودا ناتەواوی یەکانی پڕبکاتەوە • ئەم بەخشش و دیاری‌دانە بـە منـاڵ پێشنیاری فەیلەسووفی ئیسلامـە [ئیمامی غـەزالی] هـەزاران ڕەحمەت لـە گۆڕی «هـەرکات ڕەوشتێکی جوان و پەسەند لە منالێکەوە دەرکەوت ، وەیا کردەوەیەکی شیرینی کرد ، ئـەوە ڕێزانـە (إكرام)ی بدرێتێ ، وەپاداشی بدرێتـەوە بە هەرشتێك ئەو دڵی پێ خۆش بکات ، وە هـەروەها لـەلای خەڵکیش وەسپ بکرێ ••• ) •

ڕێزگرتن‌ی منـاڵ و بـەخشش پێدانی و قسەی خـۆش لەگـەڵیدا ڕووبەڕووی ئەو فەرموودەی پێغەمبـەرە ئـەکرێتەوە کـە ئەفەرموێ : [تهادوا تحـابوا] • (من أسـدى اليكم معـروفا فكافئوه ، فان لم تستطيعوا فادعوا له ••)[1] •

● خولقاندنی کەژێکی سـاف و بێگـەرد بۆی •• وەك گڵۆپـی ڕووناك و دیمەنێکی سەرنج ڕاکێشەر ••• وە هەروەها گەرما و فێنکی لەکاتی زستان و هـاویندا •• ئەمانە هـەموو یارمەتی منـاڵ ئـەدەن بۆ بەردەوام بوون لەسەر درێژەدان بە موتاڵە •

● فراوان کردنی پەڕتووکی جۆربەجۆر بۆی ••• چونکە زۆر سوودبەخشە هەرکات منال پەڕتووکی جۆراوجۆری لابێ لە چیرۆك و هەڵبەست و مێژوو و وێژە و ڕەوشت •

لەکۆتایی ئەم باسەدا پێویستە بزانرێ کە تەنها موتاڵە سوود بەخش نیە ، بەڵکو ئەبێ ئەم خاڵانە پێش چاو بخرێن :

١ ـ پێش موتاڵەکە ئەو منالە ئامادەی ڕۆحی و دەروون بکـرێ ، واتە تێبگەیەنرێ کـە مەبـەستی لـەو موتاڵەدا ئـەوەبێت کـە ببێ بـە

---

(١) واتە هەرکەسێك چاکەیـەکی لەگـەڵ کردن پاداشی بدەنەوە خۆ ئەگەر تواناتان نەبوونزای چاکەی بۆ بکەن •

خوێندەوارێکی تەواو بۆ ئەوەی بتوانێ بەرنامـەی ئیسلام بگەیەنێ بـە گرۆی ئادەمیزاد •

٢ – دانانی هێلێك لەژێر واتا گرنگەکاندا ، واتە بەقەڵەم ڕەساس هێلێك بکێشرێ بەژێر مانامەبەستەکاندا بۆ ئەوەی لەدڵیا جێگیر بن •

٣ – پەرتووکێك ئامادە بکات بۆ ئەوەی هەرشتێکی گرنگی بیست و بە جوانی زانی خێرا تیایا تۆمار بکات •

ئینجا دوای ئەوە کـە پەروەردەیەکی ڕێك‌وپێك کرا پێویستە تـێ بگەیەنرێ کە بەرامبەر بـە ئیسلام بەرپرسیارە ، واتە ئـەم چـەند خاڵە بخرێتە مێشکییەوە بەم شێوەیە :

یەکەم : ئەو کۆمەڵە خاوەن باوەڕە کە پێگەیەشتن و هەر یەکەیان بوو بە گلۆپێکی هـەزاری و وڵاتێکی ڕۆشن کردەوە و سەرکردایـەتی عالەمێکی گرتە ئەستۆی ، وە ئاڵای یەکیەتی و یەکسانی و سەربەستی••• هتد ئەوانە کۆمەڵە لاوێکی خوێن گەرم بوون ـ نەك پیر ••!!

وەك (ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عـەلی و عەبدوڕەحمان و ئەرقەم و سەعید و مصعەب و بیلال و عەممار) و سەدانی تریان هەموویان لاوو تازە پێگەیشتووبوون ، وەسنگ و دڵ و مێشکیان کردەوە بۆ ئیسلام، ئەمیش شرینقەی مەردایەتی لێدان و بوونە پاسەوانی •

دووەم : هەر ئەو لاوانـە بوون ، بوون بـە هـەڵگری مەشخەڵی ئاڵای ئیسلام ، وە لە پێناویاچەندان ئازار و ئەشکنجە دران •• بێ ئەمەی سەرشۆڕ بکەن بۆ دوژمن ڕۆژێ لە ڕۆژان ••!!

ئەوانە بوون شەوو ڕۆژ بێ‌وچان خەریکی جیهاد و تێکۆشان بوون تا حکومـەتێکی ئیسلامیان فەراهـەم هێنـا بـەسەرکردایـەتی [محمـد ـ پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ] • لەژێر ڕێبازی قورئاندا ، تا وای لێهات سـەری ئـەو دوو دەوڵـەتە گـەورەیان ـ فارس و ڕۆم

دانـەواند ، وە لـە ڕۆژهەڵاتەوە گەیشتنە شارەکانی (سند) ، وە لـە باکورەوە گەیشتە (ئەرمینی‌یە) و هەندێ شاری تر ، هەروەك شامات و میسر و برقە و ترابلس) و شارەکانی تری ئەفریقایان رزگارکرد لە زوڵم وزۆر لە ماوەی (٣٥) ساڵدا •

وە لە چەرخی (ئومەوی) یـەکاندا زۆربەی شارەکانـی (هند) و (ترکستان) کەوتە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە •

وە لە بەشی ڕۆژهەڵاتا گەیشتنە (چین) وە لە رۆژئاواوە گەیشتنە [ئەندەلوس] !!•

**مامعومەر :** مامۆستا ؛ بەڕاستی مەردوم سەری سوڕ ئەمێنێ کاتێ بیر ئەکاتەوە لـەم ئاینە کـە چۆن ئاوا بە ماوەیەکی کـەم بڵاو بووەوە بەو وڵاتانەدا !

**مامۆستا :** مام عومەر ؛ هۆی بڵاو بوونەوەی ئەم ئایینە بەکورتی دووشتە :ــ

١ ــ ئەو لاوە موسڵمانانە بەتەواوی فەرمانبەرداری ئیسلام بوون ، واتە مان و نەمانیان تەنها بۆ ئیسلام بوو •

٢ ــ بەرنامەی ئیسلامیان گەیاند بە جیهاندا بە جیهاد و قوربانی و فیداکاری ، وەبەهێزی ئارام و خۆگرتن لە ژێرباری گرانی ڕۆژگاردا •

هەوڵ و کۆشش و خەباتی بێ وچانیان گەیشتە کۆتایی ڕۆژئاوا ••!!

ئەوەبوو (عوقبــەی کوڕی نافیع) لـە کـەناری دەریـای ئەتڵەسیدا ــ بحر الظلمات ــ وەستاو فەرمووی :

[ اللهم ربَّ محمد لولا هـذا البحـر لفتحت الدنيـا في سبيل إعلاء كلمتك •• اللهم فاشهد ••!! ] •

سێهەم : ئێمەیش ئەگـەر وەك پێشووەکانمـان باوەش بکـەین بـە ئیسلامدا و خـەبات بکـەین و قوربانی بدەین •• بـە ئارام و دامەزراو

بین •• ئـەوە بێگومـان ئیسلامێکـی ڕێك و پێك بـەدەست ئەخـەین و خۆیشمان لەژێر چەپۆکی بێگانەکانا ڕزگار ئەکەین ، ئینجا سەرلەنوێ نازناوی (چاکترین ئوممەت) وەرئەگرینـەوە و چاو چنۆکەکانیش تاو ئەنێین‌و بـەرو بوومی وڵاتەکـەماتیان لێ ئەسێنیەوە ، چونکە موسوڵمانی ڕاستەقینە بەدیمەن‌مرۆڤ و ئادەمیزادە ئەگینە لەواقیعدا (کێوە) هەزارەها ڕەحمەت لە شاعیری ئیسلام ـ دکتۆر محمد اقبال ـ کە ئەفەرمووێ :ـ

من ذا الذي رفـع السيوف ليرفـع
اسمك فوق هـامات النجوم منـاراً
كانـوا جبـــالاً في الجبـــال وربّمـا
سـاروا عـلى موج البحـر أبحـاراً

چوارەم : جیهان ئەمڕۆ لەتاریکی ماددەدا ئەژی ، وە لـە ئاژاوە و ئاشووبەدا چەقیوە وە لە تاریکستانی فیکرە و ڕێبازدا سەرگەردان بووە ••!!

نابینی دەوڵـەتە گـەورەکان چۆن نینۆکیـان کردووە بـەقوڵاپ و گیراندویانەتە شارستانیەتی ئادەمیزاد ••؟!!

چۆن هێرش و هـاشاوڵ دێنن بـۆ ئاینـە ئاسمانی‌یـەکـان ••؟! ئەبێ چی جیهان بپارێزێ لەو هەموو کارەساتە ••؟ ئادەمیزاد بپارێزێ لە نزمی فیکر و هۆش ••؟ لە بێ‌ڕەوشتی ••؟ ئاخۆ کەشتی ڕزگاری لەکام لەنگەرگەدا لەنگەری گرتبێ ••؟

زۆربـەی زانا و فەیلـەسوف و فیکرڕۆشنەکان ڕایان وایـە ئـەو ڕژێمەی ئیسلام هێناویـەتی تـەنها ئەو شایستەی ئـەوەی هـەیـە ئاڵای پێشکەوتن و هێمنی و ئاسایش بگرێ بەدەستەوە •

کەوابوو با بە هەموولایە تێکۆشین مناڵەکانمان پەروەردە بکەین بـە پەروەردەی قورئان ، وە بەرەو ئیسلام بی‌یان‌بەین با زۆریش ماندوو بین، چونکە بەهەشت و ڕەزامەندی خوا بەگۆترە و خۆڕایی دەست ناکەون •

پێنجەم : مانای جیهـاد و تێکۆشـان لـەپێناوی ئیسـلامدا بخرێتـە مێشکیەوە ، واتە پێویستە لەسەر هـەموو لایەکمان زیندوو کردنـەوەی وشە و گیانی [جهاد]کە ئەویش بریتی‌یە لە بەخت کردنی گیان و ماڵ و سامان لـە پێناوی بووژاندنەوەی ئیسلام و تارنانی کافر و خوانەناس و دەرکردنی لە سنووری ئیسلام ، ـ بەتایبەت نەوەکانمان ـ ئەوانە کـە ئەبنە نیشتەجێی ئێمەو دوابەدوای ئێمەدا دێن .

بەڵێ .. پێویستە زیندووکردنەوەی ووشەی (جهاد) لە ناو دڵ و دەروونی کوریەکاندا بەم شێوازە :

أ ـ تێ بگەیەنرێ کـە سەربەرزی و رزگاری گـەلی ئیسلام تەنها لەپاڵ جیهاد و بەرزکردنەوەی قورئاندا ئەبێت :

[ يا أيها الذين آمنوا من يرتدّ منكم عن دينه فسوف يأتي الله بقوم يحبّهم ويحبّونه أذلة على المؤمنين أعزّة على الكافرين يجاهدون في سبيل الله ولا يخافونَ لومة لائم .. ] المائدة ٥٤ .

ب ـ بخرێتە مێشکیەوە کە جیهاد چەند جۆری هەیە :وەك جیهادی ماڵی و ، جیهادی پێنووس و ، جیهادی فێرکردن و ، تێ گەیاندنی خەڵك لە ئیسلام و ، جیهادی ڕووبەڕوو وەستان لەگەڵ کافران ..

**[ إن الله اشترى من المؤمنين انفسهم وأموالهم بأن لهم الجنة .. ]**

**التوبة/١١١**

**[ الذين يبلغون رسالات الله ويخشونه ولا يخشون احداً إلا الله ، وكفى بالله حسيبا ]** **الاحزاب/٣٩**

**[ انفروا خفافاً وثقالاً وجاهدوا باموالكم وانفسكم في سبيل الله .. ]**

**التوبة/٤**

ئایەت و فەرموودە زۆر زۆرە سەبارەت بە ئازایەتی و سەربەستی و پاراستنی خاکی ئیسلام ، وەڕەت کردنەوەی ستەمی هەموو ستەمکاران و قەڵاچۆ کردنی هێلانەیان .!!

شەشەم : ئازایەتی و لێهاتوویی و نەبەردی هاوڕێکانی پێغەمبەری بۆ باس بکرێ سۆ ئەوەی چاویان تێ بڕێ و بیانکات بە پێشەوای خۆی ، بۆ نموونە :ـ

أ ـ کاتێ موسڵمانەکان ڕێگەی (ئوحود)یان گرتەبەر ، پێش ئەوە پێغەمبەر ـ صلی اللّه علیه وسلم ـ سەرنجی ئەدا ئەوەی تەمەنی کەم بووایە و منداڵ بووایە ئەی گێڕایەوە،لەم سەرنجدانەدا هەندێکی گێڕایەوە وەك (رافیعی کوڕی خدیج) و (سمرەی کوڕی جندب) ، بەڵام کاتێ تێیان گەیاند کە [رافیع] دەست و مشتێکی چاکی هەیە پێغەمبەر ـ صلی اللّه علیه وسلم ـ فەرمووی دەبڕۆ ..!!

ئینجا (سمرە) دەستی کردە گریان و ووتی : پێغەمبەر ڕوخسەتی ڕافیعی داوە و بەرگری منی کردووە ، کەچی من بەزۆران ئەیدەم بەزەویدا .. ئەم قسە گەیشتەوە پێغەمبەر ـ صلی اللّه علیه وسلم ـ ئینجا ئەویش بانگی کردن و دانی بەزۆران ، لە ئەنجامدا سمرە ڕافیعی خست ..! ئیتر پێغەمبەر ـ صلی اللّه علیه وسلم ـ روخسەتی ئەویشیدا .

ب ـ کاتێ پێغەمبەر ـ صلی اللّه علیه وسلم ـ لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکردا ـ خوا لێی ڕازی‌بێ ـ گەیشتنە ئەشکەوتەکەی شاخی (سەور) ئەوەبوو لەوێ سێ ڕۆژ مانەوە لەم ماوەیەدا «عەبدوڵڵای کوڕی حەزرەتی ئەبوبەکر» دەنگ و باسی قورەیشی ئەبرد بۆیان و شەو لەوێ ئەمایەوەو بەرەبەیان زوو ئەهاتەوە و قوڕەیش بەخەیاڵیاندا نەئەهات کە شەو لەمەککە نەبووە ..!!.

حەوتەم : هەوڵ بدرێ ئەو سوورەت و ئایەتانەی مانای جیهاد و خەباتیان تیایە و داوای ڕاپەڕین و بزووتنەوە ئەکەن دژی کوفر و تاوانباران و ناپاکان ئەوانەیان پێ لەبەربکرێ وەك :ـ

- سوورەی « الأنفال »
- سوورەی « التوبـة »

- سوورەی « الأحزاب »
- سوورەی « آل عمران »
- سوورەی « محمد »

وە هەروەها پێویستە هەنگاوە پیرۆزەکانی پێغەمبەر و یارانی بیربخاتەوە ، بەتایبەت لە [بەدر ، خەندەق ، حونەین] .

هەشتەم : ڕواندنی ئاقیدە و بڕوابوون بە (قەزا و قەدەر)(۱) لە دڵی ئەو منداڵەدا .

**مامعومەر :** مامۆستا ؛ سوود و کەڵکی بڕوابوون بە قەزا و قەدەر چی‌یە ..؟!

**مامۆستا :** مام عومەر ، ئاقیدەبوون بەقەزا و قەدەر زۆر پێویستە لە ژیانی ئادەمیزادا ، چونکە ئادەمیزاد هەڵئەنێ و شرینقەی ئازایەتی لێ ئەدات و تێی ئەگەیەنێ هەرچی تووشی ئەبێت بە ئاگاداری و فەرمانی خوایە وە شانس و ناوچاوی خۆیەتی ، کەواتە ئەوەی خوا مەیلی لێ نەبێت و ئارەزووی لەسەرنەکات هەموو بوونەوەر هەڵسێ ناتوانێ تووشی‌بکات .. وە ئەوەیش خوا بڕیاری لەسەر دابێت هەرئەبێت و ڕەتکردنەوەی نیە . وەك پێغەمبەری خۆشەویستمان حەزرەتی محمد - صلى الله عليه وسلم - ئامۆژگاری عەبدوڵلای ئامۆزای ئەکات و ئەفەرموێ :

« احفظ الله يحفظك ، احفظ الله تَجِدْهُ تجاهك ، اذا سئلت فاسأل الله ، واذا استعنت فاستعن بالله . واعلم أن الأمة لو اجتمعت على أن

---

(۱) داوا لە هەموو پەروەردەکاران ئەکەم کە هێندێ ژیانی هاوەڵانی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بخوێننەوە بۆ خێزانەکەیان ، بەتایبەت کورپەکانیان وەك . یەکەم - زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بەکوردی . دووەم: صور من حياة الصحابة دكتور عبدالرحمن رأفت الباشا .. وە هەرچی تر سوود بەخش بێت بۆ ئەم بابەتە .

ينفعوك بشيء لم ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك ، وان اجتمعوا على أن يضرّوك بشيء لم يضرّوك الا بشيء قد كتبه الله عليك رُفِعَت الأقلام وجفّت الصُحُفُ •• )[1] ، واته ئاگاداری فەرمانەکانی خوا بکە ، خوایش تۆ ئەپارێزێ و دێت بەدەمتەوە لە هەموو کاروباری گیتی و ڕەستاخێزتا ، وەژیانێکی خۆش و بەتامت ئەداتێ ، وە لە تەنگ و چەڵەمەی هەردوو جیهان پارێزراو ئەبیت ، وە هەمووکات خوات لەگەڵ ئەبێت ، چونکە ئەگەر لەکاتی خۆشیدا خوا بناسیت ، خوایش لەکاتی ژیر و گرفتدا فریات ئەکەوێ •

(یونس) پێغەمبەر ــ علیه الصلاة والسلام ــ خوا رزگاری‌کرد لە سکی ماسیەکەدا چونکە پێشتر راست بوو لەگەڵ خوادا ••

(فیرعەون) لەکاتی دەسەڵات و فرمانڕەواییدا لەگەڵ خوادا نەبوو، خوایش لە تەنگانەکەیدا نەهات بەسەردەمیەوە ••!

(وە هەرکات داوات کرد هەر لە خوا دوا بکە) ، واتە ئەبێ‌بەندە نهێنیەکانی خۆی تەنها لای خوا بلێت •• ئینجا ئەگەر ئەوشتە داوا کراوە لەوانەبوو ــ کە تەنها شایەنی خوایەتی خوایە ــ وەك داوای ڕێگەی بەختیاریی و ، زانیاریی و چاکبوونەوە لەنەخۆشی و ••• (هتد بائەوە تەنهالە خوا داوای بکات ، خۆ ئەگەر باوی خوا وابوو ئەوشتەی لەسەردەستی خەڵکیدا جێبەجێ بکات ، وەك ئەو شتانەی بەسراون بەئیش و کار و پیشەسازییەوە ، ئەوە بۆ ئەم جۆرەشتانە داوا بکات لەخوا کەدڵیان نەرم بکات ، تا ئیشەکەی بۆ بکەن ، ئەمەیە کە ئەفەرمێ: (واذا استعنت فاستعن بالله) •

کوڕەکەم : بزانە ئەگەر هەموو کۆمەڵ بێتەوە بەیەك بۆئەوەی سوودێکت پێ بگەیێنن، ناتوانن، مەگەر خوا بۆی نووسیبیت ،وە ئەگەر

(۱) تیرمذی لە ئیبن عەبباسەوە گێڕاویەتەوە •

کۆبنەوە تا بەڵکو زیانێکت پێ بگەیێنن، ناتوانن، سامەگەر خوالەسەری نووسییت ، واتە قازانج و زیان تەنها بەدەست خوایە ، ئەگەر خوا بیەوێت تووشی سوودێکت بکات کەسێکت بۆ فەراهەم ئەهێنێ، وە ئەگەر ویستی تووشی زیانێکت بکات ئەوە هەر بەئاگاداری ئەوە ، ئیتر پێنووسەکان لە کارخراون و ، پەڕەکانیش ووشك بوونەوەتەوە ، واتە هەموو کار و بارێك لەلای خوا کۆتایی پێهاتووە، وە لە (لوح‌المحفوظ)دا تۆمار کراوە ، ئیتر هیچ شتێکت بۆ زیادو کەم ناکت .

جا کە وابێت ئیتر مەردم لەچی بترسێت ..؟! سڵ لەچی بکاتەوە..؟ لەکاتێکدا هەموو شتێ بەفەرمانی خوابێ(١) ..!

مام عومەر ؛ داوا لە تۆو لە هەموو پەروەردەکەرانی منال ئەکەم - بەزوبانی ئورتانەوە - کە ئاکاتان لە خاووخێزان بێ ، وە بەدوای ئامۆژکاری یەکانی ئیسلامدا رێکەیان پێ بگرنەبەر ، چونکە زاناکانی ڕەوشت و کۆمەلایەتی هەموو ڕایان وایە کە ئەگەر بەو شێوەیە - باس کرا - منال پەروەردە بکرێ چاکی و پاکی مسۆگەر ئەبێ . بە مەرجێ تۆی پەروەردەکەر ئەوئامۆژکاری‌یانە لە پێش‌دا لەخۆتا پیادەبکەی بۆ ئەوەی ئەوکەسەی ئەتەوێ ئامۆژگاری بکەیت ڕەخنەت لێ نەگرێ و ووتەکانیشت بێ بایەخ نەبن لەلای . بۆیە ئەڵێن لار و چەوتی و لاساری منال بەزۆری ئەگەڕێتەوە بۆ [بەخێوکەر]ئیتر هەرکەسێك بێ..!!

منالّ چۆن چاك ورێك و پێك ئەبێ لەکاتێکدا باوکی بەرەڵای بکات لەگەڵ هاوڕێی ناپاکدا هەڵسووکەوت بکات ..!!؟

- ئاقیدە و بیر و بڕوای منالّ چۆن دائەمەزرێ و لەق و لۆق نابێت، لەکاتێکدا باوکی بینێرێتە خوێندنگایەك پلار و توانج لە ئیسلام بگرن ..!!؟

---

(١) بۆ ئەوەی زیاتر فەلسەفەی قەزاو قەدەرت بۆ ڕوون ببێتەوە تەماشای کتێبی [ من هو سید القدر ... ؟ ]بکەلە نووسینی مامۆستا دکتور محمد سعید رمضان البوطي .

- منالّ چۆن خاوەنی خووی پەسەند و رەوا ئەبێت باوکی گۆڤاری بێ ڕەوشتی بۆ بکڕێ ، یـاخۆی بـە دەستی‌یـەوە بێ ، وە خـەریکی خوێندنەوەی چیرۆك و شانۆگەری و ئەوین بازی بێت ..!!؟

- بەگشتی باوکێك خۆی خـاوەن خووی جوان نـەبێت .. چۆن منالەکەی بەڕەوشت ئەبێت ..!!؟

مام عومەر ؟ ئەوەیشمان لەبیر نەچێت کە زۆربەی باوکن ئەڵێن : خوا خۆی ئەم منالەی بە بەدخوو و خراپ دروست کردووە ..!! ئیتر تەربیە و پەروەردە هیچ نابەخشێ .

لەڕاستیدا ئەم داوایە پووچەڵ و بێ ناوەرۆکە ، چونکـە کـەس نـەچووە ناقیبی [لوح المحفوظ]بکات بزانێ منڵـەکەی چۆن دروسـت کراوە ..!! ئەوا بوو هۆی نەگبەتی و نەدامەتی منالەکە بەخێوکەرەکەیە، چونکە هاوڕێیـەکی خراپی بووە و ئـەم چاوی لێ نووقاندووە .. وەیا بەپێی رێباز و پرۆ گرامی ئیسلام لەگەڵیا نەجووڵاوەتەوە ..!!

ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی تریشەوە موسڵمانان بیرو ڕایان وایـە کە ئەم نەوەی ئێستایە ئەگەر ئیسلام بکـات بـە ئاقیدە و ڕەفتاری ، وە ئەمۆژگاری‌یەکانی بکات بەپرۆگرام و ڕێباز . ئـەوا رەوشت و خووی پێشینان زیندوو ئەکاتەوە .. وە لە جیهاندا دەوڵەتێکی گەورە و لێهاتوو بنیات ئەنێن ... گەلانی تریش دوایان ئەکەون .

بەکورتی :

ئاخری ئەم ئوممەتە ئیسلاح و رێك وپێك نابێت بەوە نەبێت کـە سەرەتاکەی پێ دامەزراوە .

- هەزار ڕەحمەت لەگۆڕی خـەلیفـەی دووەم (عومـەری کوڕی خەتتاب) کە ئەفەرمووێ :

[ نحن قوم أعزّنا الله بالاسلام فمهما ابتغينا العزّة بغير ما أعزّنا الله به أذلّنا الله[1] .. ] .

مام عومەر ؛ چەند پڕمانا و سوود بەخشە ، وە ترسێنەر و راچڵەکێنەرە ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە ـ صلی الله علیه وسلم ـ

[ ولا حكم أمراؤهم بغير ما أنزل الله إلاّ سلّط الله عليهم عدوّهم فاستنقذوا بعض ما في أيديهم ، وما عطّلوا كتاب الله وسنّة نبيّه إلاّ جعل الله بأسهم بينهم .. ] .

**مام‌عومەر :** مامۆستا ؛ واتای فەرموودەکەی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ چی یە ؟

**مامۆستا :** کاکڵەی مانا و مەبەستەکەی ئەمەیە :

« ئەمیر و کارگێڕانی وڵات هەرکات یاسا و ڕژێمێکیان داهێنا ـ بێجگە لە فەرموودەی خوا ـ و کردیان بە ڕێباز و پەیڕەوی کرا ، ئەوە خوا ـ جل جلالە ـ دوژمنی خۆیان زاڵ و پایەدار ئەکات بەسەریانا، ئینجا هەندێ لەوەی لەدەستیانایە لێیان زەوت ئەکات ، وە هەروەها هەرکات فەرموودەی خواو پێغەمبەریان خستە پشت گوێ و بڕیاریان پێ نەدا .. خوا جەنگ و ئاژاوە و هەراو شەڕو شۆڕیان لەناوا هەڵئەگیرسێنێ .. » .

**مام‌عومەر :** مامۆستا ؛ وادیارە ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە ـ صلی الله علیه وسلم ـ هاتووەتە ڕوو ، بۆیە بەڵاو گیروگرفت و ناهێمنی ئەوەندە بڵاو بووەتەوە ..!

**مامۆستا :** بەڵێ .. سەد لە سەد وایە ، چونکە کاتێ زاڵمان و ستەمکاران کار و باری وڵاتیان گرتە دەست ، وە بەووتە پووچەڵەکانیان بڕیاریاندا .. ئاژاوە ڕوویکردە ، ناوچەکان ، دوژمن زاڵ بوو بەسەر

---

(١) واتە ئێمە خوا بە هۆی ئیسلامەوە سەری خستین وە هەرکات داوای سەرکەوتن بکەین بەبێ ئیسلام ئەوە خوا ژێر دەستمان ئەکات .

خاکی ئیسلامدا هێمنی و ئاسوودەیی لێ زەوت کردین ••• بەروو بوومی خاکی ئیسلامیان لێ سەندین ئێمەیش بەدەست خاڵی ، ماینەوە و چاوەڕوانی پاشماوەی ئەوانین و ئاواتەخوازین ئاوڕێکمان بەلادا بدەنەوە ••!!

بەڵێ •• هەر ئەو دەمە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەریان فڕێدایە ڕەفەی لەبیرچوونەوە جەنگ و هەراو نەدامەت ڕەشماڵی خۆی هەڵدا بەسەر کۆمەڵدا ••

بەڵێ •• هەر ئەو حەلە قورئانی پیرۆز لە ئیشی سەرەکی خۆی خرا ، دوژمن زاڵ بوو و زۆربەی ئەو شوێنانەی پێغەمبەر و هاوەڵە بەشەرەفەکانی کیان و سامانیان لەپێناوا بەخت کرد ، جارێکی تر درایەوە دەست کوفر ، ڕووناکی تیا کوژایەوە ••

وەك ئەو پێنج ناوچەیە کە ئێستا (ڕووس) داگیری کردووە ،یاوەك خاکی [فەلەستین] و هەندێکی [لوبنان و میسر و سووریە ••] !

کە ئەمەیش لەکەو تانەیەکی زۆر گەورەیە بەسەر چاوی عەرەبەوە بەتایبەت ، چونکە عەرەب کاتیخۆی گەلێکی بەش خوراوی چەوساوە بوو لەژێر چەپۆکی [فارس و ڕۆما] تا ئەم قورئانە هات و ئەوانیش پەیامەکەیان هەڵگرت و تەنها ئاڵاکەی ئەویان بەرزکردەوە •• ئەو حەلە خۆرهەڵات و خۆرئاوا و خوارووو ژووری زەویان کەوتە ژێردەست[1] ••

گەورەی وڵات بوون تا قورئان مامۆستایان بوو •• کاتێ لایاندا لە ڕێگە ڕاستەکەی ، ئینجا پەستی و کزی و داماوی ئاڵایە ملیان ، وە بوون بە ژێر پێوەو ماف و بەشیان داگیرکرا، بەجۆیێ جوولەکە کە بێ نرخ و ڕیسوا وژێر دەستەی هەموو جیهان بوون لێیان ڕاست بوونەوە و لە

(١) لقد أنزلنا اليكم كتاباً فيه ذكركم أفلا تعقلون ••؟ الأنبياء/١٠

جەرگەی خاك و وڵاتیانا دەوڵەتێکیان پێك هێنا کە گاڵتە و لاقرتی ئەکات بەو هەموو میریە عەرەبانە کـە ژمارەیان بـەناو ئەگاتـە (٢٢) میری و ژمارەیان پتر لە سەد ملیۆن کەسە[1] ..!!

مام عومەر دەبا ئـەمـە دوا ووتـەمان بێت و کۆتایی گفت و گۆ و پرسیار و وەڵامەکانمانی پێ بێنین، بەهیوای ئەوەم سوود بەخش بێت بۆ تۆو بۆ هەموو باوکێکی موسڵمان و ئاشنا بەقورئان ، بۆئەوەی بکرێ بـە رچە لە پەروەردەی کۆرپە و ساواکانماندا .

ئیتر خوایش لـە تاوان و هـەڵەکانمان ببورێ و دڵیشمان ڕووناك بکاتەوە بەتیشکی قورئان و فـەرموودە شیرینـەکانی پێغەمبـەرمان محمد ـ صلى الله علیـه وعلى آلـه وصحبـه وسلم ـ وە تۆیش خـوا یـار و یاوەرت بێ .

٤ ربیـع الأول ی ١٤٠٢هـ
٢٩ کانوونی‌یەکەمی ١٩٨١ز

---

١ ـ سەیری تەفسیرەکەی مامۆستا مەلاعثمان ، سەرەتای بەرگی ١٧ بکە .

سەرچاوەکان :

١ ـ القرآن الكريم
٢ ـ في ظلال القرآن
٣ ـ الاسـلام
٤ ـ الاسلام يقيناً لا تلقيناً
٥ ـ أخلاقنا أو الدمار
٦ ـ إحياء علوم الدين
٧ ـ من هدى النبوة
٨ ـ تربية الأولاد في الاسلام
٩ ـ هذا نبيّك يا ولدي
١٠ ـ الحلال والحرام في الاسلام
١١ ـ التاج الجامع للاصول
١٢ ـ تحفة المحتاج
وە هەندێ سەر چاوەی تری کوردی و عەرەبی

| سەرباس | لاپەڕە |
| --- | --- |

| سەرباس | لاپەڕە |
|---|---|
| ئیسلام‌و لاوەکان | ٣٤ |
| فرۆیدو ووتەکەی | ٤٠ |
| هۆی تێکدانی لاوەکان | ٤٢ |
| ئیسلام‌و تەلەفزیۆن وسینەما | ٤٢ |
| دیمەنی چوارەم | ٤٧ |
| سودو کەڵکەکانی ژن‌ومێردی | ٤٧ |
| کام ئافرەت ئەخوازی ؟ | ٥٢ |
| ئافرەت چ پیاوێ هەڵبژێری ؟ | ٥٣ |
| سەعیدی کوڕی‌موسەیب | ٥٥ |
| دیمەنی پێنجەم | ٦٣ |
| چۆن منداڵەکەت پەروەدە ئەکەیت | ٦٣ |
| ناوێکی خۆشی بنێ | ٦٥ |
| مناڵ‌چۆن‌پەروەردەبکرێت واەبێت | ٧١ |
| پەیوەندی مناڵ بەچەند شتێکەوە | ٧٣ |
| مناڵ‌ومزگەوت | ٧٥ |
| دیمەنی شەشەم | ٧٩ |
| نەخشەی کۆمەڵایەتی بۆمناڵ | ٨١ |
| مامۆستاومورشیدی ڕاستەقینە بناسە | ٨٢ |

| سەرباس | لاپەڕە |
|---|---|

**ئەم کتێبە :**

- چەکێکە لە پەروەردەی ئیسلام ... دڵۆپێکە لە دەریای بێ بنی ئیسلام .
- پەنجە رانەکێشێ بۆ هەندێ لە نەخۆشییەکانی ناو کۆمەڵ، لە گەڵ چارە سەریشیاندا .
- دەری بڕیوە کە رووس و ، ئەمەریکا و ، فەرەنسە و ، چین و ، هند و ، ... هتد دەستە وسان وەستاون لە چارەسەری گیر و گرفتەکانی ئەمڕۆی کۆمەڵ .
- چەسپاندوویەتی کە تەنها ئیسلام ئەزانێ رۆڵە و ، سەرباز ویشتمەرگە پێ بگەیەنێ .
- پێت ئەڵێت : کە ئەبێ پەروەردەی منداڵەکەت چ لەماڵەوە ، چ لە مزگەوت چ لە قوتابخانە بە شێوەیەکی قورئانی بێت .
- بانگێکە بۆ لاوان بۆ دۆزینەوەی رێگەی بەختیاری .
- تێت ئەگەیەنێ کە سەهیۆنیزمی جیهانی و ، هەموو دەست و دائیرەکەی وان لە سەرگەرم کردنی تۆی (لاو) دا ، تا بەنجت بکەن و ، ئەوانیش ئایین و وڵات و نیشتمانمان لە دەست وەرگرن .
- داهاتوو و پاشە رۆژ هەر بۆ ئیسلام ئەبێت بەگەواهی مێژوو .
- تەنها بە ئیسلام ئەتوانین هەنگاو هەڵگرین بە رەوڕزگاری و ئازادیمان .

وەرگێڕ [illegible]